# هەستن بەرەو ڕێگای بەهەشت

نووسینی

عبدالله خاکی

پێداچوونەوەی

ڕەنج شێخانی





**هەستن بەرەو ڕێگای بەهەشت**

ناوی پەڕتووك: "هەستن بەرەو ڕێگای بەهەشت"
نوسینـــی: "عبدالله خاکی"
پێداچوونەوەی: "ڕەنج شێخانی"
پێـداچوونەوەی ڕێزمـانی "ژووان ع. قانونی"
نەخشەسازی ناوەوە: "ناوەندی "ئیسلامڕەو"
نەخشەسازی بەرگ: "ناوەندی "ئیسلامڕەو"
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم: 1437،2016

{وَسَارِعُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ}ال عمران{133}

**واتە: پەلەو چەسپانی بکەن بۆ کردنی ئەوشتانە ئەبنە هۆی لێبوردنی پەروەردگارتان وچوونە بەهەشتێکی فراوانی وا کە: هەرپانتاییەکەی بەئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە، ئامادە کراوە ئەو بەهشتە بۆ پارێزکاران.**

# پێشکەشە

❖ بە دایك و باوکی ئازیزو خۆشەویستم.

❖ بەوبراو خوشکانەی خەمخۆری یەکترن لەسەر بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا.

❖ بەوکەسانەی تەنازول ناکەن لە عەقیدەو بیروباوەڕیان بۆ هیچ کەس و لایەنێك تەنها بەندەی خوای گەورەن.

❖ بەسەر جەم موسڵمانانی ئەو پەری جیهان

❖ بەو موسڵمانە خواویستانەی خەریکی کۆکردنەوەی توێشوون لە دنیای فانی بۆئەو ڕۆژەی نەباوك بۆ ڕۆڵەکەی و نەڕۆڵە بۆ باوکی هیچ سوودی نییە.

خاکی

# بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفَرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ. يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ وأنتُمْ مُسلِمونَ.

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجَالاً كَثيراً ونِساءً واتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيباً.

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قَولاً سَديداً، يُصلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوزاً عَظيماً..

أمَّا بعدُ: فإنَّ اصَدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدِي هَدْيُ محمدٍ صلى الله عليه وسلم، وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ،وكُلَّ ضَلالةٍفي النَّارِ

## پێشەکی مامۆستا ڕەنج شێخانی

لەپاش سوپاس و ستایشی بێ پایانم بۆخوای پەروەردگاری جیهانیان و سەڵاوات و سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەری کۆتا زەمان محمد(ﷺ) لەپاشادا:

خۆم بەخۆش حاڵ دەبینم لەم سەردەمی پێش کەوتنی تەکنەلۆژیا کە ئیسلام غەریب بۆتەوە لەناو خەڵکی داو، زۆرێك لەخەڵکی بەهۆی تێکەڵ بونیان بەدنیاوە، دوارۆژیان لەیادکردووەو ،لەبەرامبەریش دا زۆرێکلەزاناوبانگخوازەکانیشمان شوێن هەواو ئارەزووەکانیان کەوتون یان کەم تەرخەمن لەئاستی گەیاندنی ئەوبانگەوازە پاك و بێگەردەدا وەك خۆی، گەنجێکی تەمەن بیست ساڵانی وەك کاکە عبدالله خاکی دەبینم ، کە بە قەڵەم و نوسین و بابەتە شەرعی و بەسوودەکانی لەجیاتی شوێن کەوتنی هەواو ئارەزووەکانی و هەوڵ دان بۆ گەشتن بە دەیان خولیاو ئاواتی گەنجانەی ، زۆر جوامێرانەو بوێرانە ئەسپی خۆی تاوداوە تا لەوتەمەنە گەنجیەتیەی دا خزمەت بەناگەوازی ئیسلام و ڕابوونی ئیسلامی بکات.لەڕاستی دا ئەگەر چی سوپاس بۆ خوای گەورە ئەم بەندە تاوانبارەی تاقی کردۆتەوەکاتێکی وام لەبەردەست دا نەبوو بۆ خوێندنەوە، بەڵام کاتێك کە لەپێشەکی کتێبەکەم ڕوانی نەم توانی بوەستم لەخوێندنەوە کتێبەکە،

تـا كۆتـا پەڕەیـم تەواو نەكـرد، چـونكە بەڕاسـتی زاخـاوێك بـوو بـۆ دڵی منـیش ، هێنــدە بەجــوانی شــەرعی و كــورتی و پــوختی بابەتەكـانی ڕازانــدۆتەوە ، خــوێنەر پەل كـێش دەكـات بــۆ تەواوكردنــی تەواوی باسەكان، چونكە سەرلەبەری كتێبەكە زاخاوی دەرونە بۆ ئەودڵە بێ ئاگایانەی كە دنیـاو خۆشی یە كاتی یەكانی فریـوی داون و، دەرمـانی زامەكانیـانی تێـدایەو ،لەجیـاتی دڵ بەسـتنیان بەدنیـاوە ، سـەرنجیان ڕادەكێشێت بۆ خۆشی یەكی ڕاستەقینە و ژیانێكی پڕ بەختەوەری كە تەنها لەبەهەشتی پان و بەرین دا، دەتوانن بەدەستی بخەن، وە پڕن لەپەندو ئامۆژگاری جوان بۆ كەسانێك كەبەڕاستی بەدوای هیدایەت دا دەگەڕێن.داواكارم لەخوای گەورە نمونەی ئەم گەنجە بەڕێزە زیاد بكات ، وە ئامۆژگاریم بۆ گەنجە بەڕێزو خۆشەویستەكانمان ئەوەیە لەجیـاتی سـەرقاڵ بـون و بە ڕەوشـت و ئاكاری هەرزەكارانەو لاسـایی كـردنەوەی گەنجـانی بێ بـڕواو هونەرمەنـدو گۆرانی بێژە فاشـیلەكان، پێویستە لەسەرتان كە چاو لە نمونەی وەك كاكە عبدالله خـاكی بـۆ خواسوڵحاو و دین دار بكەن ، تاوەكو هەر لەم تەمەنە گەنجێتی یەدا خـوای گەورە پلەوپایەتـان بەرزوبڵنـد بكـات و خۆشەویسـتی ڕێزتـان لەدڵی باوەڕداران دا جێگیر بكات.خوای گەورە پاداشتی خێری هەوڵ و تێكۆشان و ماندووبونت بداتەوە ،

هیـوادارم كاكە عبـدالله خەرمـانی پڕ بەرەكەت بێـت و خـوای گەورە زیاتر شارەزای بكات لەدینەكەی تاخزمەتی زیاتر بكات ، ئامۆژگاریشم بـۆ كـاكە عبـدالله ئەوەیە تازیـاتر نیەتـت بـۆ خـوای گەورەت پـاڵفتە بكەیـت و لەسـەر قورئـان و سـوننەت كاربكەیـت ، بـێ پـرس و ڕای مامۆسـتایان و بـانگخوازان هەنگـاو نەنێیـت، ئەوە خـوای گەورە سـەركەوتنت پـێ دەبەخشـێت، خـوای گەورە لەشـەڕی نەفـس و شـەیتان و خـراپەی خراپەكـاران بەدوورت بكـات و بیكـاتە توێشـوی دوارۆژتان.

لەگەڵ ڕێزوخۆشەویستی برای موحتاج بەدوعای خێر: ڕەنج شێخانی وڵاتی فنلەندا

9 ی ذوالحجة 1437 ی كۆچی

بەرامبەر:2016/9/11

# پێشەکی

بسم اللهالرحمن الرحيم

الحمدللهرب العالمين الصلاة والسلام على قائد المرسلين محمد (ﷺ) و على اله و أصحابه و من تبعه بإحسان إلى يوم الدين.

اللهم أرِنا الحقّ حقًا وارزقنا اتباعه, وأرِنا الباطل باطلاً وارزقنا اجتنابه. أمابعد:

لەم ڕۆژگـارەی ئێسـتا زۆربەی خەڵکی بەدوای دنیـا و خۆشـییەکانی کەوتـــوونە، بــێ ئاگــان لە ئــاخیرەت،هەروا دەزانـــن کە بۆدنیـــا دروستکراون. بۆیە بەپێویستم زانی وەک ئەرکێکی سەرشانم بتوانم تەنها کەمێك ویژدانییان بجوڵێنم بەنووسینی ئەم کتێبە،کە بە ناوی "هەســتن بــەرەو ڕێگــای بەهەشــت" لــەبەر ڕۆشــنایی قورئــان و سوننەت،کە چەندین بابەتی لەخۆگرتووە، هەموو ئامۆژگاری خەم خــۆرین بۆتــۆی بــەڕێز داواکــارم بــەگوێ دڵ گوێبیســتی ووتــە و ئامۆژگارییەکان بیت کە ڕێخۆشکەرن بۆ چوونەژێر ڕەزامەندی خوای گەورە، گەرهاتووخوێنەری ئازیز بەدڵ و دەروونێکی فراوانەوە قبوڵی بکات.بابەتـەکان بەگشـتی بـاس لـە تـاوان و سـەرپێچییەکانی ئـەم ڕۆژگـارەی غوربـەتی ئیسـلام دەکەن، ڕێگـای چاکـە و لێخۆشـبوونی خوای گەورە لە بەندەکانی،پاشان مرۆڤمان هانداوە کەواز لە تاوان و بێفەرمانی کردنی خوای گەورەبێنێت بۆچوونە ژێر ڕەحمەتی خوای پەروەردگاری. پاشـان هـەوڵی بتەوکردنی براییـەتی موسڵمانانمان داوە

لەسـەر ئەساسـی قورئـان و سـوننەت بـۆ بـوون بـە یـەك جەسـتەو لاشـە.سـەرچاوەی سـەرەكی ئەم كتێـبە تەنها قورئـان و فەرمـوودەی پێغەمـبەری نـازدارە(ﷺ)بەتـایبەت ئەو فەرمـوودانەی (بوخـاری و موسـلیم) ریوایەتیـان كردووە،كەڕاسـترین كتێـبن لەدوای قورئـانی پیرۆز.وەفـەرموودەی حەسـەن كە زۆر بەكـەمی بـەكارم هێنـاوە، هەروەهـا هـیچ فەرموودەیـەكی لاوازم بـەكار نـەهێناوە.سودیشـم لە كتێبی گەورە زانایانی ئومەت وەرگرتووە،داواكارم لەخوای گەورە ئەم كارە كەمەم بەخێر لێ وەربگرێـت و بیكـاتە توێشـوو بۆسـەرتەرازووی چاكەكـانم. پاشـان هیـوادارم خـوێنەری بەرێـز سـوودی لێوەربگیرێـت وەهەڵەكانم بەدیاری بۆبنێرێت، چونكە ئەوەی ڕاستە لەخوای گەورە پاشـــان پیغەمـــبەری خـــوا(ﷺ)وەرگیـــراوە.هەرچیش هەڵە و كەم و كورتیبێت لە دەروونی منی بەندەی لاوازە. خوای گەورە بمان پارێزێت لەهەڵەیدەروونمان.

(اللهم لاتكلنی إلی نفسی طرفه عین)

عبدالله مەهدی

ناسراوبە:عبدللە خاكی

# تاكەی لەخەوی بێئاگایی

ئەی خەڵكینە ئەی ئەوانەی سەر قاڵبوونە بەدنیاوە! بەسە تاوەكو كەی بێئاگای لەم ژیانەی دنیا كەنقوومی خەوی غەفڵەت بوونە! ئایا دەتەوێ لەدوارۆژدا بەسەرشۆڕی بژی بەڕیسوایی؟! هۆشت بێنە سەر خۆت بزانە چیت بەرێكردووە بۆ ڕۆژی لێ پرسینەوەت؟ **{اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ}**[1] واتە: لە خوابترسن وە هەموو كەسێك با سەرنج بدات بزانێ چی پێش خۆی ناردووە بۆ پاشەڕۆژی.ئایا ئەو بارەی لەگەڵ خۆت دەبەی بۆ دوارۆژت قورسەو بارەكەت پڕی چاكەیە؟ یاخود سوكەو هیچ توێشوت بەڕێنەكردووە لەدنیای فانی! برای بەرێز خوشكی سەنگین بۆچی ماوەیەكە بەرۆكی دنیات گرتووە و بەری نادەی بەزۆریش وازی لێ نایەنی! لەكاتێكدا دنیا هیچ سوودی نیە بۆت! مەگەر بۆخۆت چاكەی تێدا كۆبكەیەوە بەڕێی بكەی بۆ دوای خۆت كە مردنە. مەگەر نا تۆ هەر بۆدنیا بكە هەر پارەی بۆ كۆبكەوە، هەر خانووت بەرز بكەوە، هەر بەدوای ژنی جوان بگەڕێ،دنیا هەر بەجێت دێڵێت ئەگەر ڕۆژێك لەتەمەنت مابێت، لەم ڕۆژگارە زۆربەی خەڵكی هەرخەریكی ئەوەن ژیانی خۆیان خۆشبكەن دووربن لەناخۆشی هەموو هەوڵێك ئەخەنە گەڕتا بەس بەخۆشیبژین!بەڵام بەڕاستی ئەم خەڵكە زۆر سەیرن هەموو ماندوو بوونێكیان بۆدنیایە كەمانەوەیان كاتیە! چەنساڵێك ئەمێننەوە دواتر مردن بەرۆكیان ئەگرێت بەرەو دنیای ئەبەدی ئەبات!

---

[1] الحشر . {18}

ئایە بۆچی کەمێکیش بۆ خوا خۆت ماندوو ناکەی؟ تا لەو ژیانە کاتیە بەهەشـتێکی هەتاهەتایت پێبـدات! ئایـا کـاتی ئـەوە نـەهاتووە تـۆزی غەفڵـەت ڕابمـاڵین کۆشـش بکـەین بۆدنیاکـەی تـر کـە قیامەتـە؟ خوێنـەری بـەڕێز کـەمێ بیربکـەوە بزانـە چ تۆیـەکی چاکـت چانـدووە لەدنیای کاتی تا بەهۆی بەرەکەوە دایك وباوك وخۆتیش ڕزگار بکەی لــەئاگری دۆزەخ خــوا بمــان پارێزێ،لــەکاتێك هەرکەســەو بەتــەنها مامەڵـەی کردەوەکـانی لەگـەڵ دەکرێـت بەتـەنها لەبـەردەم بارەگـای خـوای گەورەیـە گـەر لـەدنیا هـەموو پشـتت بـوون تۆیـان ئەپاراسـت کەچی لەقیامەتدا کـەس پشـت و پەنات نیە .{ **وكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْدًا**}[1] واتـە: یەکـە یەکـەی ئەوخەڵکـە بـە تـاك و تـەنهای دێـت ئامادە دەکرێت لەبەردەم دادگای پڕ لـە دادوەری خـوادا.لـەو ڕۆژەی کـە هـەر کەسەو خەمی خۆیەتی! ئاگاداربە کە بەرەکەت بە هەدەر نارۆوات کە لـەدنیا تـۆی چاکـەت چانـد شـەونخونیت بـۆکردوو ژیانـت هـەمووی خـەم بـوو تابـەس بەرەکـەی چـاك و بـاش بێـت. {**يَـوْمَ تَـأْتِي كُلُّ نَفْـسٍ تُجَادِلُ عَنْ نَفْسِهَا وَتُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ**}[2] واتـە: ڕۆژێك دێـت کـە هـەموو کـەس خـەمی خۆیـەتی، بـەرگری لـە خـۆی دەکات، پاکانە بۆ خۆی دەکات، گوێ بەکەسی تر نادات، ئەو ڕۆژە هەرکەس پاداشــتی کردەوەکــانی دەدرێتــەوە و ئــەو خەڵکــە ســتەمیان لـێ ناکرێت.بۆیـە تـاکو لـە ژیـانی چاکـە بکـەو ببـە بەکەسێکی بـۆ خـوا سولحاو. بیربکەوە لەوساتەی کەمردن بۆت دێ،

---

[1] مريم . {95}
[2] النحل . {111}

چونكە مردن پرست پێ ناكات كاتێ دەگات! كە مردن بۆت هات ڕێزت ناگرێت! ناڵێت ئەوە هەزارە گوناحە با فرسەتی بدەم بۆئەوەی منداڵەكانی یەتیم نەبن و خزمەتیان بكات بێكەس نەبن! نەخێر بەهیچ شێوەیەك مردن كەهات ڕێزی لانیە سۆزی لانیە رەحمی لانیە! مەجالت نادات یەك چركەش یەكسەر ڕاپێچت دەكات لەگەڵ خۆی! هەركە بەس خوای پەروەدگار فەرمان بكات بەفریشتەی مەرگ (ملك الموت) یەكسەر ڕاپێچت دەكات! فەرمانی خوای تاك و تەنها پشت گوێ ناخەن فەوڕییە! **{وَإِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ}**[1] واتە: جا هەر كاتێك بڕیاری هەر شتێك بدات، تەنها ئەوەندەی بەسە كە فەرمانی بوون یان پێشهاتنی بدات، ئیتر خێرا ئەو شتە، یان ئەو كارە، دەبێت و ئەنجام دەدرێت. پاك و بێ گەردی بۆخوای پەروەردگار! تاكەی لە بێ هۆشی؟ ئەی ئەوانەی بێ هەستن بەسە وشیار ببنەوە دڵەكانتان بە ئاگا بێنەوە لە خوا بترسن بگەڕێنەوە بۆسەر ڕێگای ڕاست كەئیسلامە ! چونكە تۆنازانی سەرئەنجامت چیەو بەیانی چی ڕوودەدات **{وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا}**[2] واتە: هیچ كەس نازانێ سبەینێ لە داهاتوودا چی دەكات چی بەسەر دێ، وەكەس نازانی داخۆ لەكوێ گیان ئەسپێرێ **{وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ}**[3] واتە: وە هیچ كەس نازانێ لە چ شوێن و زەوی یەك دا دەمرێ .بۆیە با لە ئێستاوە تاكو زووە مردن یەخەی نەگرتووین بامەردی خوابین باكارو كردەوەكانمان بۆخوابێت،

---

[1] البقرة .{117}
[2] لقمان . {34}
[3] لقمان . {34}

با دڵەکانمان خاوێنبکەینەوە لەژەنگی تاوان کەبۆتە هۆی تورەبوونی خوا لێمان،باخۆمان ڕادەستی خوابکەین **{وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ}**[1]واتە:هەوڵبدەن هەمیشەو بەردەوام دڵتان لای خوا بێت و بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگارتان وتەسلیمی ئەو بن. بەڵێ با لەودنیایەوانەکەین دڵی شەیتان خۆشبکەین بەهۆی سەرپێچیکردنی خوا،بادایک وخوشکانمان فێری پەروەردەیەکی پێغەمبەری خوا(ﷺ)بکەین بادڵ ونەفسی خۆمان لەگەڵ قورئان وفەرموودەکانی پێغەمبەری نازدار(ﷺ)ئاشنا بکەین تالەڕۆژی دوایی خوای پەروەردگار بانگمان بکات بۆبەهەشت پێمان بفەرمووێت من لێتان رازیم**{ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً}**[2]واتە: بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت کە تۆ لەو ڕازیت وئەویش لە تۆ ڕازیە،با لەگەڵ بەندەکانی خوابین ئەوانەی بۆخوا ژیان**{فَادْخُلِي فِي عِبَادِي}**[3]واتە: دەبچۆرە ڕیزیبەندە چاکە نازدارو بەڕێزەکانمەوە،دوای داخلی بەهەشتمان دەکات **{وَادْخُلِي جَنَّتِي}**[4] واتە: بچۆرە بەهەشتە خۆشە ڕازاوەکەمەوە. با ئێمەش یەکێک بین لەوانە ئەی برایان وخوشکانم ئەگەر بزانن چونکە ئەوەی لای خوایە باشترە بێ کۆتاییە. بۆیە لە ئێستاوە بریار بدە تائەو کاتەی دەگەڕێیەوە لای خوای رب العالمین بۆ خوا بژی خۆت یەکلا بکەوە بەڕاست و دروستی تۆزی غەفڵەت ڕابماڵە لەسەر دڵ و دەرونت باتۆزێك لەزەت لەژیانی کورتی دنیا بکەی وپاشان لەقیامەت بژی بەشادی و کامەرانی...

---

[1]الزمر . {54}
[2]الفجر . {28}
[3]الفجر . {29}
[4]الفجر . {30}

## موسڵمان چۆن لەدنیا بژێت؟

كاتێك باسی ژیانی دنیا ئەكەین بەڕاستی مرۆڤی موسڵمان وا هەست دەكات كەبوونی لەم دنیا هیچ بەهایەكی نیە! خۆ ماندووكردن و كۆكردنەوەی سەروەت و سامان بەرزكردنەوەی خانوو، دڵ خۆش كردن وهەست كردن بەمانەوەی یەكجاری لەم دنیایە،هیچ گرنگ نیە بۆكەسێك كە بەڕاست و دروستی خوا بناسێ،بەڵێ خوێنەری بەڕێز دەبێ ئامانجی موسڵمان لە دنیا تەنها ئەوە بێت كە خوا لێی ڕازی بێ{رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم}[1] واتە:خوای میهرەبان لێیان رازییە،دەبێ ئامانجمان لەژیانی دنیا تەنها رازی بونی خوای گەورە بێت بەڵام ئەوەش بزانین لە دنیادا هەول و كۆشش و ماندوو بوونی بێ وەچانی دەوێت،بۆ رازی بوونی خوای گەورەوە بەدەسهێنانی بەهەشت.هەروەک چۆن قوتابی لە قوتابخانە تێدەكۆشێ بۆ دوارۆژێكیگەش و بەدەست هێنانی ئامانجەكەی كە ئاواتییەبۆ گەیشتن بە: (دكتۆر،مامۆستا،ئەندازیار.هتد). خەمی سەرەكی بەدەست هێنانی نمرەی بەرزە بۆ مسۆگەر كردنی مەبەستەكەی! بەڵام بە دەست هێنانی ڕەزامەندی خوا پاشان بەهەشت ئامانجێكە

[1] المائدة {119}

بـۆ گشـت مرۆڤێکی موسڵمان دەبێ هەولی بـۆ بـدات شـەونخونی بـۆ بکات تا وەدەست بێنێت، بێ گومان دەبێ موسڵمان بۆئەو مەبەستە تێبکۆشێ لـەم دنیایە. چونکە ئەو کەسەی دەیەوێ خوای گەورە لێی ڕازی بێت ئەزانێ ئـەم ژیانـەی دنیا ماوەیەکی زۆر ناخـەیـەنێ، مانـەوەی یـەکجارەکی لەدنیاکـەی تـرە کـە قیامـەتی نەبڕاوەیـە هـەروەك خـوایی پایەبـەرز فەرموویـەتی:**{إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الآَخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ}**[1]واتە: بەڕاستی ژیانی ئەم دنیایە ڕابواردنێکی کەمە وە بەڕاستی هـەر پاشـەڕۆژ جێی حەسـانەوەی هەمیشـەییە. بۆیـە هـیچ گرنـگ نیـە پشت بەستن و دڵ خۆشکردن بەم دنیایە بەڵکو هەوڵی ئەوە دەدات بـەهۆی کاروکردەوەی چاکـە لـەم دنیایـە ژیـان بباتـە سـەر، بـەڵێ وە ئاگـادار کراوەتـەوە لەلایـەن خـەم خـۆری ئوممـەت پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)کـە دنیـاهیچ قـەدری نیـە لـە لای خـوای پـەروەردگار گـەرهاتبا دنیـا نرخی هـەبا ئـەوا کـافرو بـێ باوەڕەکـان وابـەخۆش یوڕابـواردن نەئەبوو**{لَوْ كَانَتِ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ}**[2]واتە:ئەگـەر دونیـا نرخی باڵـە مێشـولەیەکی هەبووایـە لای خوا گەورە ئەوا قومە ئاوێکی لێ نادا بەکافران.

---

[1] غافر.{39}

[2] { اخرجه ترمذی}

بەڵێ برای بەرێز خوشکی سەنگین دەبێ ئێمەی موسڵمان ئەم تەمەنەی خۆمان بۆ خوا سەرف بکەین لەکارێك کە خوا پاشان پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)پێ ڕازی بوو ئەنجامی بدەین. چونکە دنیا و ئەوشتانەی کەلەدنیان بەر نەفرینی خوا کەوتوون مەگەر بەیادی خوا و پاشان ژیان بۆ خوا بردنە سەر لەم دنیایە مرۆڤی موسڵمان سەرکەوتوو بکات ڕەزامەندی خوا بەدەست بێنێ. بەڵێ ئەی بەندەکانی خوا دنیا ژیانێکی کەم و کورتە خوای گەورە دنیای بۆ ئەوە دروستکردووە تاکو مرۆڤەکان تاقی بکاتەوە داخۆ کێ گوێڕایەڵی داکات وکێ بێفەرمانی دەکات و سەرکەوتن بە دەست دێنێت **{الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا}**[1] واتە: ئەو زاتەی کە مردن و ژیانی داهێناوە تا تاقیتان بکاتەوە کە کردەوەی کامتان چاکترە. لەم رۆژگارەی ئێستا دنیا زوو ماڵئاوایی لە مرۆڤەکان دەکات و هێدی هێدی رۆژگار بە جێ دێڵێت. بیرتە تۆ دوێنێ چەن ساڵ بووی ئێستا بووی بەچەند؟! بەڵام بەداخەوە مرۆڤەکانیش هەر ئالودەی دنیا دەبن و پشت لە دینی خوا دەکەن، هەوڵدەدەن زیاتر ژیانی خۆیان خۆش بکەن مەبەستیان تەنها دنیایی کاتییەئاخیرتیان بیرچۆتەوە.

---

[1] الملك. {2}

**{بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا}**[1] واتە: کەچی ئێوە ڕێبازی ڕزگاری ناگرنە بەرو بەڵکو زیاتر ژیانی دنیاتان مەبەستە. ژیان بەسەر بردن لە ئاخیرەت چاکتر و بەردەوامترە ئەگەر بزانن **{وَالْآَخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَى}**[2]. واتە: لەکاتێکدا قیامەت و بەدەست هێنانی بەهەشت چاکترە و بەردەوامیشە. بۆیە با هیچ کات بە خۆشیەکانی دنیا نەخەڵەتێین دڵمان پێخۆش بکەین کە وابزانین هەر بۆ دنیا دروستکراوین تاکو بە ئارەزووی خۆمان بەرێوەی ببەن. **{فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا}**[3] واتە: ژیانی دنیا هەڵتان نەخەڵەتێنێ. بێگومان ژیانی دنیا مرۆڤەکانی بە خۆیەوە غافڵ کردووە، وایان لێ هاتووە دووارۆژیان بیر چووەتەوە چونکە ئەمانە تەنها شارەزای ژیانی دنیان **{يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآَخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ}**[4] واتە:ئەوانە هەرڕواڵەت لەژیانی دنیابەدی دەکەن،لەبەرامبەرقیامەتیشەوە بێئاگان. بۆیە کەسانێك نایانەوێ ئامۆژگاری بکرێن بەس ئارەزوویان خۆشی و ڕابواردنە و بەدوای مۆدیلی سەیارە کەوتوون و دنیای کاتیان دەوێت زۆر بێئاگان لەوەی دنیاکەی تریان بەنرخترە لە چاو ئەم ژیانە کە دوا ڕۆژی نەبڕاوەیە!

---

[1] الأعلى .{16}
[2] الأعلى .{17}
[3] لقمان . {33}
[4] الروم . {7}

**{وَمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ وَإِنَّ الدَّارَ الْآَخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ}**[1] واتە: ئەم ژیانەی دنیا تەنها رابواردنێکی بێ هودە ویاری منداڵانە وەهەرچی ژیانی ڕاستەقینەیە هەردەمی یە ژیانی ئاخیرەتە ئەگەر بزانن!ژیانی دنیا کاتیە بۆ مرۆڤەکان ماوە بە ماوەیە و نەوە لە دوای نەوە دێت و تۆ لەم دنیایە ماوەت کاتیە ماوەیەك ئەمێنیتەوە و مردن ئەتگەێنتە شوێنی مەبەست ئەوجا بە هەشت یاخود دۆزەخ ئەبێتە شوێنی مانەوەی یەك جاریت. دە بیر بکەوە ئەی ئەو کەسەی کە ژیرو ئاقڵی کە دەزانی ژیان بەسەر بردن لەم دنیایە کاتیە!! بۆچی ئەیدۆرێنی ژیانی ڕاستەقینەو نەبراوە !. بۆچی هۆشو ئەقڵت لە دەست داوە دەتۆزێك بیر بکەوە هۆشت بێنەوەسەر خۆت. بە دنیا پەرستان هەڵمەخەڵەتێ ئەوانەی ژیانی ئاخیرەتیان فرۆشتووە بەشتێکی کەمی دنیایی، یان ژیانێکی خۆشیان هەیە سەیارەو خانووی بەرزیان هەیە لەپارك و سەیرانگاکان بەکەیفی خۆیان دەسووڕێنەوە زۆر ئاگاداری خۆت بە پێیان هەڵمەخەڵەتێ.**{لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي الْبِلَادِ}**[2] واتە:لەخشتەت نەبات هەڵتنەخەڵتێنێ ئەوانەی کوفریان کردووە و ڕوویان لەدنیایە.هەردەم بیرت باڵای قیامەت بێ

---

[1] العنكبوت.{64}
[2] ال عمران . {196}

چونكـه ئەوكەسـانەیبەدوای دنیـا كەوتوونـه خۆشـییەكی كـەمیان بۆهەیە پاشـان شـەرمەزاری ڕۆژی دوایین ، بـەهۆی پشـتكردنیان لـە بەرنامـــەی خـــوای گـــەورەكـــەئیســـلامەتاكـــە بەرنامەیـــەبۆ بەختـــەوربوون.{**مَتَـــاعٌ قَلِيـــلٌ ثُـــمَّ مَـــأْوَاهُمْ جَهَـــنَّمُ وَبِـــئْسَ الْمِهَـادُ**}[1] واته:خۆشـییەكی كـەمیان بـۆ هەیـە و پاشـانیش جێنشـینیان دۆزەخـە كە چەندە جێگایەكی بەدو ناخۆشە. بەڵام ئەوانەی لـەخوا ترسان و پشـتیان لـەدنیا كـردوو بۆ قیامـەت هـەوڵ و كۆششـیان كـرد ئــەوا بەهەشــتانێكیان بــۆ هەیــە كەچەنــدەها ڕووباریــان بــەژێردا دەڕوات و بەنـەمری تیایـدا دەمێنـەوە {**أُولَئِـكَ أَصْحَابُ الْجَنَّـةِ هُمْ فِيهَـا خَالِـدُونَ**}[2] واتـە: هـەر ئـەوانن نیشـتەجێی بەهەشـتن و تیایـداژیانی هـەتا هـەتایی دەبەنـە سـەر. ئەی بەنـدەكانی خـوا بـا ئامانجیئێمـەلەمدنیایە ئــەوە بێــت كــە بــۆ خــوا ژیــان ببەینــە ســەر دڵنیــابن خــوای گــەورە پاداشــتێكی نــەبڕاوەمان پــێ ئەبەخشــێت لــەدوا ڕۆژی نــەبڕاوەدا .

[1] ال عمران . {197}
[2] البقرة .{82}

# ئامۆژگاری بۆگەنجان

گەنجـەکان بەشـێکی گـرنگن لـەژیانی مرۆڤایـەتی، گـەنج ئەکەوێتـە نێـوان منـداڵی و پیری ، مـاوەی تەمـەنی زێڕپینـە بۆیـە زۆر پێویسـتە لەسەریان ئەو تەمەنە ناسکەیان لەژیانی دنیا لەکاری چاك بەسەر ببەن. چونکە تاکو تەمەنت گەنجەو لاوی پیری بێنە پیش چاوت کە ئـەو کـات دەبیتـە پەککەوتـە لەماڵـەوەئەکـەوی هـیچ چاکـە و خـوا پەرستیت پێ ناکرێ! بۆیە ئەی گەنجی ژیرتاپیر نەبوویوهۆش وئەقڵت لەدەسـت نـەداوە لەئێسـتاوەقۆڵتهەڵبکەلـەکارو کـردەوەی چاکە.پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەفەرمووێت:پێنج شت پێش پێنج شتی تر بقۆزنەوە یەکێك لەوان **{شَبابِك قَبل هَرَمِك}**[1]واتە: گەنجیت پێش پیر بـوون. ئـەی ئـەو گەنجانـەی خۆتـان پێ قـۆزە وبـەخۆتان ئـەنازن! وا ئەزانن کەهەر وا بەگەنجی ئەمێننەوە پیرنابن! ئایا سەیری دەوروبەری خۆت کردووە ئایە هیچ کات بیرت کردۆتەوە ئەو هەموو پیرە هەن ! خـۆ کاتی خـۆی لـە تـۆ گـەنجترو تونـدوو تۆڵتربـوون ! ئایـە تەماشـایی باوکت کردووە کاتی خۆی وەك تۆ گەنجێك بو کەهیوای بەدنیا بوو کەچی ئێستا مووی سەری سپی بووە بەرەو پیر بوون هە نگاو دەنێ! خوای گەورە دەفەرمووێت:

---

[1] { صحيح المسلم}

**{اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ}**[1] واتە: خوا زاتێکە ئێوەی دروستکردووە لە لاوازی (لاوازی نوتفەو بێچوو منداڵی شیرەخۆر...) پاشان دوای لاوازی بەهێزی کردوون (بوون بە لاو) لە دوا بەهێزکردنتان لاوازی و پیری بۆ دانان خوا هەرچی بوێت دروستی دەکات. باش بزانە ئەی گەنج بێگومان لە ڕۆژی دوایی لێ پرسینەوەت لەگەڵ دەکرێت دەربارەی ئەو تەمەنە ناسکەت کە لە چی سەرف کرد لەکاری خوا پەرستی و ڕێگای تەوحید یاخود لەکاری باتڵ و لەو کارەی کەدڵی شەیتانت پێ خۆش دەکرد کە سنور بەزاندنی ڕێگای یەك خواپەرستی بوو. پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)دەفەرمووێت: لە ڕۆژی دوایی قاچی هیچ بەندەیەك لاناکەوێت تا وەکو چوار پرسیاری لێ نەکرێت **{ لاتَزُولُ قَدَمُا بْنِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ أَرْبَعٍ: عُمُرِهِ فِيمَاأَفْنَاهُ }**[2] واتە: لە ڕۆژی دوایی قاچی هیچ بەندەیەك لاناکەوێت تا چوار پرسیاری لێ نەکرێت تەمەنی لە چی بەسەر برد؟ ئەمە پرسیارێکە بۆگەنجەکان هەر لە دنیا ئاشکرا بووە!! ئەوجا تاکو لەدنیای ئەی گەنج تاپیری ڕێگای لێ نەگرتووی پشتت نەچەماوتەوە هۆشت بێنە سەر خۆت وازبێنە لە تاوان و سەرپێچی چونکە بێگومانڕۆژێك دادێ پیر بوون چاوەڕێتە!

---

[1] الروم .{54}
[2] **{ رواه ابن حبان والترمذی في جامعه}**

مووی سپی پێت دەڵێ هەستە بزانە چیت ئامادەکردووە بۆ ئەو ڕۆژەی کەبەتەنها دەگەڕێتەوە ماڵی هەتا هەتایی کە گۆڕی تەنگوتارە! **{وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ}**[1]واتە: (خەڵکینە) لە سزاو تۆڵەیڕۆژێک بترسن کە تیایدا بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە. پێویستە لەسەرگەنج هەوڵبدات هاوڕێی چاك و پاك بدۆزێتەوە بکەن بەرەفیقی خۆتان، چونکە هاوڕێی چاك و خراپ دواڕۆژت دیاری دەکات، بەوەی کەوا گەنجێکی باش بیت یاخود خراپ و دوور لەبەرنامەی خوا و ژیانێکی تاڵ! دەبێت باوك و دایك هەر لەمناڵیەوە فێری پەروەردەیەکی پێغەمبەری بکات (ﷺ)وە چاودێرێکی پوختی بکەن هاوڕێیەکی چاك بۆمناڵەکانیان بدۆزنەوە، بۆئەوەی گەر بوون بەگەنج پێیەوە ماندوو نەبن دواڕۆژێکی باشیان هەبێ بۆ گشت لایێك. هۆ گەنجەکان ئەی ئەوانەی دوور لەبەرنامەی خوا ئەژین و ماوەیەکە دڵەکانتان ژەنگی تاوانی لەسەر نیشتووە! چی وای لێ کردوون تووشی تاوان و بێ فەرمانی کردنی خوا بن!؟ ماوەیەکە بێزار بوونە لەژیان بەهۆی ئەوەی دوور لەبەرنامەی خوا ئەژین هیچ خۆشییەکتان نەبینی لەو تاوانەی ماوەیەکە تێیکەوتوون! ژیانیش بێزار بووە لەئێوە چونکە گوێڕایەڵی خوا ناکەن!

---

[1]البقرة . {281}

{يَا أَيُّهَا الإِنْسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ}[1] واتـە: ئـەی ئینسـان، چی وای لێکردوویـت کـە سـەرکەش بیـت بەرامبـەر پـەروەردگاری میهرەبـان و بـەڕێزت؟ چی وای لێکردوویـت کـە وەکـو پێویسـت قـەدری نـەزانیت؟ ئەوەی لـە ئاسمان و زەویە هەمووی یادی ئەو خوایە ئەکەن ئێوەی گەنجی خوێن گەرم بەهۆی ئەوەی ڕووتان لـەدنیا کردووە تەمەنتان لـە کاری بێسـوود و پـارك و شوینەگشـتیەکان بـازار بەسـەرئەبەن کـە بۆتـە هـۆی ئەوەی خواتـان لـەبیر کـردووە! {تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ}[2] واتە: ستایشی خوا دەکەن هەر حەوت ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لـە ناویاندایە وە هیچ شتێك نیە کە سوپاسی ئەو ستایشـە نـەکات. کـەچی ئێـوەی لاوی تەمـەن ناسـك تووشـی گێژاوی تـاوان بوونـە بێ فـەرمانی خـوای پـەروەردگار ئەکـەن! ئایـە چی وا دەکات بێ فـەرمانی خـودا بکـەی!؟ ئایە ڕزقی پێ نـەدای؟ ئایە پۆشتەی نـەکردی؟ ئایە بۆ وا بـێن بەرامبـەر بـەو خالقـەی کـە مرۆڤـەکانی بـەجواترین شـێوە دروسـت کـردوە ، هەریەکـەو بەشـێوە و ڕەنگێـك و قـەم و هۆزێـك پاشـان جیـای کردووینەتـەوە لەهـەموو بوونـەوەرەکان {الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ}[3] واتـە: ئەو(پـەروەردگار)ـەی کـە دروسـتی کردوویـت و ڕێکی خسـتویت و جیـای کردویتـەوە لـەگیانلەبەرانی تـر. ئایا بۆ وا بێ

[1] الأنفطار . {6}
[2] الأسراء . {44}
[3] الأنفطار . {7}

وەفابین بەرامبەر بەو خوایە كەوا ئەو هەموو فەزڵ و چاكەی بەسەر رشتووین كە بۆمان ناژمێردرێت! **{وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا}**[1] واتە: واتە: خۆ ئەگەر بەهرەو نیعمەتەكانی خوا بژمێرن بۆتان ناژمێردرێن. بەڵام مرۆڤەكان زۆر بێ وەفان و تاوان كارن بەگوێی هەواو هەوس و ئارەزوویان دەكەن! **{إِنَّ الْإِنْسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ}**[2] واتە: بەڕاستی ئادەمی (بێ بڕوا) زۆر ستەم كارو سپڵەیە. بەڵام بزانە ئەی گەنج گەر لەئێستاوە چاكە نەكەی خۆت بۆ الله یەكلا نەكەیەوە، ئەوا بێگومان هەر دەگەڕێیەوە بۆ لای ئەو خوایەی كە یەكەمجار دروستی كردووی دوایی دەت مرێنی دوایی زیندووت دەكاتەوە، بۆلێپرسینەوە **{مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى}**[3] واتە: ئێمە ئێوەمان هەر لەم زەویە دروستكردووە، دوای ماوەیەك دەتانخەینەوە ناوی، پاشان جارێكی تر دووبارە لەو زەویە دەرتان دەهێنینەوە بۆ لێپرسینەوە و وەرگرتنی ئەو پاداشتەی كە شایستەن. بۆیە تاكوو لەدنیان و نەمردووین هەست و هۆشت بێنەوە سەر خۆت توێشوو بەڕێ بكەبۆ دوارۆژت تاكو بەدەست بێنی ڕەزامەندی الله و پێت ببەخشێت ژیانێكی خۆش و بەختەوەر لە بەهەشتەكەی.

---

[1] الابراهیم{34}
[2] الابراهیم .{34}
[3] طه . {55}

# موسڵمانی سەرکەوتوو کێ یە؟

بێگومـان کـە باسـی موسـڵمانی سـەرکەوتوو ئـەکـەین ئـەو بـراو خوشکانەن کە مەبەستیان ڕازی کردنی خوای پەروەردگارە لەهەموو کات و ساتێکدا، هیچ ئاواتیان ژیانی دنیای کاتی نیە بەڵکو هیوایان گەیشتنە بەخوا.ئەم جۆرە کەسانە لەدنیا زۆر ماندوون بەشەو و رۆژ خەریکی بانگەوازی کردنن بۆ یەك خوا پەرستی و هاندانی خەڵکن بۆ ڕێگای تەوحید. حەزناکەن خەڵك تووشی تاوان و بێفەرمانی کردنی خـوا بـن چونکـەدەزانـن سـەرئەنجامیان چیەکـە دۆزەخە.بەڕاسـتی ئەمانەموسـڵمانی سـەرکەوتوون چونکـە چیـان بـۆ خۆیـان پێ باشـە زیاتریان بۆ خەڵکی دەوێ لەوەی خۆیان! ئەمانە کاتێك بەسەر زەوی دا دەڕۆن بەبێ فیـزو خۆ پێ گەورەیی هەر دەم موسـڵمانی خـاکین هـیچ شـتێك بەگـەورە نـازانن جگـە لـە خـوای تـاك و تـەنها! هـەروەك خـوای گـەورە دەفەرمووێـت: **{وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا}**[1] واتـە: بەنـدە تایبەتییـەکانی خـوای میهرەبـان کەسـانێکن بەویقارو نـەرمی دەڕۆن بەسـەر زەوی دا بێ لـوت بـەرزی و کەشخەو فیزکـردن وەکاتێـك نـەزان ونەفامـەکان بەوتەی ناشرین لەگەڵیان بدوێن وتەیەك دەڵێن پێان گوناهنەبێت.

---

[1] الفرقان . {63}

وە کاتێك ئەبیندرێن لەناو خەڵکی ئەوا خوای گەورە یان بیردێتەوە! پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەربارەیاندەفەرمووێت:{**أولياءّ الله الّذين إذا رآهم النّاس ذكّروا الله**}[1]واتە: دۆستان و ئەولیاکانی خوای پایەبەرز ئەوانەن کەوا ئەگەر ببینرێن لە لایەن خەڵکەوە ئەوا خوای پایەبەرزیان بیردەکەوێتەوە. بەڕاستی ئەمانەنموسڵمانی سەرکەوتوو هەم لەدنیا هەم لە قیامەت! ئەم موسڵمانە خواویستانە کاتێك لە شوێنێك باسی ئایەتەکانی خوا یان گوێ بیستی دەبن تەزوو بەلاشە یاندا دێت { **تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ**}[2]**واتە:ئەو کەسانەی لە خوای پەروەردگاریان دەترسن بەبیستنی قورئان پێستیان تەزووی پیادێ** . پاشان ئیمانیان زیاد دەبێت لەهەموو کارو بارێکدا تەنها پشت بەخوا دەبەستن، بێگومان ئەمانە نمونەن بۆموسڵمانان گەر بێتو چاویان لێ بکەن. هەرەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: {**إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ**}[3]واتە:بێگومان بڕواداران کەسانێکن کە کاتێك باسی خواو ناوی هێنرا دڵیان دەترسێت وترسی لێ دەنیشێت کاتێکیش ئایەتەکانی خوا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بڕوایان زیاد دەبێت وە هەر پشت بەخوا دەبەستن. بۆیە لەسەر ئێمەی موسڵمان پێویستە چاو لەو کەڵە پیاوانە بکەین کە ئامانجیان خوا لە خۆ ڕازیکردنە!

---

[1]{صحيح المسلم}
[2]الزمر.{23}
[3]الأنفال . {2}

بێگومان ئەمانە لەسەر ڕێگای ڕاستی ڕێبازپێغەمبەری نازدارن(ﷺ)هیچ کات خەفەت ناخۆن هەمووکاتێك ترسی خوایان لە دڵدایە لەهیچ کەس ناترسن جگە لەخوا.لە ژیانی دنیادا زۆر توشی نارەحەتی ئەبن بەهۆی بڵاوکردنەوە یەك خوا پەرستی و داوکردن لەخەڵکی کە بسەڵمێنن تەنها ملکەچی فەرمانی خوای پایەبەرزن سەری خۆیان بۆ غەیری خوای پەروەردگار بۆهیچ کەس و بەندەیەك نزم نەکەن ، بۆیە ژیانی دنیا هەموو بۆیان خەم ناخۆشییە تووشی کێشەو نارحەتی وگرتن و دەردە سەری دەبن ، خوای گەورە دڵ نەوایان دەکات پێیان ڕادەگەیەنێ کەسارد نەبنەوە لەسەرعەقیدەوبیروباوەڕیان هەر ئێوەسەرکەوتوو سەرفرازن **{وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنْتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ}**[1]واتە: کۆڵ مەدەن و ساردمەبنەوە و خەفەت مەخۆن، چونکە هەر ئێوە سەربەرزو سەرفرازو سەرکەوتوترن ئەگەر ئیمانداری چاک و ڕاست و دروست بن. ژیانی دنیا بۆئەم جۆرە موسڵمانانە شوێنی نارحەتیەهیچ خۆشیك نابینن وەك ئەو کەسانەی بەس بەدوای خۆشی و ڕابواردنن خەریکی فستەق خواردن و پالدانەوەی بەر سپلیتن فتوا بەدڵی عەلمانیەکان بدەن تەنها بۆئەمە زیرەکن ، جا ئیهانەی دین دەکرێ جوێن بەخوا ئەدەن یا قورئان بسووتێنن پەنا بەخوا ئەمانەش پێیان لەسەر پێ ، بۆیە دەڵێن با کڵاومان بگرین با نەی بات خۆشی و ڕابواردنەکەمان لێ تاڵ نەبێت

[1]ال عمران . {139}

بۆیەدنیا بۆئەم جۆرەکەسانە بەهەشتە کەچی گوێ نادەن بەوەی ئەم ژیانە کاتییە قیامەت مانەوەی یەکجارییە ، بەڵێ بەلام بۆ موسڵمانە ڕاستەقینەکان زیندانەهیچ خۆشییەك نابین . پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)دەربارەی ژیانی موسڵمانی سەرکەوتوو لەدنیاکەحاڵیان چۆنە دەفەرمووێت:**{الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ وَجَنَّةُ الْكَافِرِ}**[1]واتە:دنیا زیندانی موسڵمانە و بەهەشتی کافرەکانە. بەڵام ئەمانە هیچ ناترسن لە تانەو تەشەری دنیا ویستان و گوێ نادەنێ چیان پێ ئەوترێ خەفەت ناخۆن چونکە دەزانن ئەو کارەی دەیکەن بۆ ڕەزامەندی خوایەو بەهەشتی لەگەڵە! هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: **{أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ}**[2]واتە: ئاگاداربن بێگومان دۆستانی خوا ترسیان لە سەرنییە خەفەتیش ناخۆن. بەڕاستیئەمانە بۆ مردن ئەژین تا بەهەشت بەدەست بێنن و بگەڕێنەوە لیقای خوای پەروەردگار. بەڵام کەسانێك هەن بۆدنیا ئەژین مردنیان لەبیر کردووە تەنها شارەزان بە ژیانی کورتی دنیالەبەرامبەرقیامەتیشەوەبێئاگان.بەراستی ئەم کەڵە پیاوانە لەو پەیمانەی لەگەڵ خوایان دابوو ڕاستیان کرد بەجێیان گەیاند لەژیانی کورتی دنیا!

---

[1] {صحيح المسلم}
[2] يونس .{62}

{أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ}[1] واتـه: ئا ئەوانـه كەسـانێكن ڕاستیان كـردووه و هـەر ئەوانەشـن پارێزگارو خـواناس و دیندارن. هیچ خۆشیان نەبینی لـه دنیای فـانی گەڕانەوه لای پەروەردگاریان بـه سـەر بـەرزی بەهەشـتیان مسـۆگەر كرد.ئەمانەموسـڵمانی سـەركەوتوون جێگای شـانازین بۆئوممـەتی ئیسـلام نـەك ئەوانـەی بۆدنیـا ئـەژین .

بۆیە لەسەر ئێمەی موسڵمان پێویستە چاو لەو
كەڵە پیاوانە بكەین كە ئامانجیان خوا لە
خۆ ڕازیكردنە

[1] البقرة . {177}

## بۆهاتووینە دنیا ؟ بۆ سووككردنی خەڵك !

یەكێك لە هۆكارو گرفتەكان كە بۆتە هۆی پەرتەوازە و دووبەرەكی نێوان برایەتی موسڵمانان لەم ڕۆژگارە بریتیە لەوەی شانازی كردن بەقەوم و خۆ گەورەكردن بەسەر خەڵكی تر كە لەقەوم و عەشیرەتی ئەو نیە ، موسڵمان هەیە خۆی پێ شوێنكەوتەی سەر ڕاستی ئیسلامە هەموو پێنج فەرزێك لە مزگەوتە لە ڕاستیدا وانیە بەڵكو جیاوازی دەكات لە نێوان قەومەكان كەچی هەموو قەومەكان هەر مرۆڤن لە قوڕ گل دروست بوونە. پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەفەرموێت: { **كُلُّكُمْ لِآدَمَ وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ** }[1]واتە: هەمووتان نەوەی ئادەمن وە ئادەمیش لە گل خۆڵ دروست بووە . گەر بێتوو سەیری هاوڵانی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بكەین هەریەكەو لە قەومو هۆزێك بوونە بەبێ جیاوازی كردن و بە سوك سەیری یەكتر كردن,ئا (ئەمە بیلال حەبەشی وسە لمانی فارسی و سوهەیبی ڕۆمی) هەریەكەو لەوڵاتێكەوە هاتبوونە نێو بەرنامەی ئیسلام جا كاتێك كۆچ ئەكەن بۆ شاری مەدینە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ)برایەتی ئەخاتە نێوان موهاجیرو ئەنساریەكان كە برایەتیكیتووندو تۆڵ دروست ئەبێت هەموو ماڵ و سەروەتیان لەگەڵ یەكتر بەش ئەكەن و ئەیدەن بەبرا موهاجیرەكان, ئەمەش هەمووی ئیسلام و ئیمانە وا دڵەكانی پەیوەستكردن بەیەكەوە . خوای پەروەردگاریش باسی ئەو پەیوەندیە ئیمانیە دەكات

---

[1]{أخرجه أبو داود في كتاب الأدب}

دەفەرمووێت:{وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مَّا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ}[1]. واتە: دڵەکانیشیانی بەست بەیەکەوە، ئەگەر هەرچی دارایی زەوی هەیە، هەر هەموویت خەرج بکردایە تا دڵەکانیانت پەیوەند بکردایە بە یەکەوە، ئەوە نەتدەتوانی ئەو دڵانە پەیوەست بکەیت بەیەکەوە، بەڵام خوا (بەهۆی ئاینی ئیسلامەوە) خۆشی و یەکریزی و برایەتی لە نێوانیاندا بەرپاکرد. بۆیە هەرکەس باوەڕی بە بەرنامەی خوای گەورە هەبێ کە ئیسلامە ئەوە دەبێتە موسڵمان و دەبنە برای ئیمانی یەکتر هەروەك پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) دەفەرمووێت: {الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ}[2] واتە: موسڵمان برای موسڵمانە . بۆیە ناکرێ موسڵمان جیاوازی بکات لەگەل برای ئیماندارەکەی با لەهەر قەومێکی تر بێت ,پێغەمبەری نازدار(ﷺ) دەفەرمووێت:{ يَا أَيُّهَا النَّاسُ ، أَلاَ إِنَّ رَبَّكُمْ وَاحِدٌ ، وَإِنَّ أَبَاكُمْ وَاحِدٌ ، أَلاَ لاَ فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى أَعْجَمِيٍّ ، وَلاَ لِعَجَمِيٍّ عَلَى عَرَبِيٍّ ، وَلاَ لأَحْمَرَ عَلَى أَسْوَدَ ، وَلاَ أَسْوَدَ عَلَى أَحْمَرَ إِلاَّ بِالتَّقْوَى}[3]واتە: ئەی خەلکینە، خودای ئێوە یە کە، وە باوکتان یەکە، عەرە بێك لە عەجەمی فارسێك زیاتر نیە، وە فارسێك لە عەرە بێك ، وە سوورێك بە سەر ڕەشدا، وە ڕەشێك بە سەر سووردا جگە لە تە قوا خوا پەرستی نە بێت . بەڵام بەداخەوە

---

[1]الأنفال{63}

{[2]أخرجه أحمد}

{[3]رواه أحمد و وصححه الألباني}

بۆ كەسانێك بەخۆیان ئەڵێن موسڵمان كەچی جیاوازی ئەكات ئایە ئەو كەسەی قەومەكەی خۆی پێگەورەترە لەوانی تر ئایە قەومی خۆی لە زێر دروست بووە یا ئەڵماس كەئەوانی تری پێ سوكترە دڵی ڕەقــە بەرامبــەریان هەركاتێـك باسـی ئەوقەومـانە دەكرێـت دەلێـت بێـدەنگبن سـووك و بێڕێن ئـایە ئەوانـیش هەر خـوای گەورە دروسـتی نەكـردوون . { **أَمْ خُلِقُـوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ** }[1]واتە: ئایـا ئـەوان (بێ دروسـت كارێـك) لـە خۆیانـەوە دروسـت بـوون . بـزانە ئەی ئـەو كەسـەی كـە خـۆت پێ موسڵمانەو قەومەكانی تـرت پێ سـووكە لای خـوای گـەورە تەنها ئەوانە بەڕێزن كە لەخوا ترس و موتەقیە .{**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ : سُئِلَ رَسُول اللَّهِ** (ﷺ)**مَنْ أَكْرَمُ النَّاسِ ؟ قَالَ : أَتْقَاهُمْ** }[2] واتە: لە ابو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت : دەفەرمووێت: پرسیان لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەڕێزترین خەڵك كامەیە , فەرمووی تەقواترینان . واتە ئەوكەسە بەڕێزترینە كەلە خوا ترسە با ڕەش پێستێك بێت لەو پەڕی شـەرق و غـەربێت ئەوەی گرنگە تەنها موسڵمانەو لەخوا ترسـە .لـە دینی خـوای گـەورە لەنێـوان ئەو قـەوم و هۆزانـە هـیج شـتێك جیـاوازی نیـە لای خـوای پـایە بەرز نەزمـان نە رەنـگ , نە قەوم و عەشیرەت ..هتـد . تـەنها تـەقوا و لەخواترسـان نـەبێت .بۆیـە ئـەوەی جیـاوازی دەكـەن و گاڵتە بە قەومەكانی تـر ئەكەن خۆیـان بەگـەورە

---

[1] الطور.{35}
[2] {متفق علیة}

ئەزانن لەئاست هۆزو قەومەکانی تر جیاوازی ئەکەن ئەوان بابزانن بەوکارانە نزیکە کافردەبن . پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)دەفەرموێت: **{اثْنَتَانِ فِي النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ : الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ ، وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ}**[1]واتە:دووشت خەڵك پێی کافر دەبن ئەویش تەعنەدان لە هۆزوقەوم و گریان بۆمردوو بە دەنگ وهاوار. وە ئەو کەسە موسڵمان نیە کە جیاوازی دەکات لەنێو قەومو عەشیرەتەکان چونکە دینی ئیسلام هیج جیاوازیك ناکات لە نێوان عەرەب و عەجەم و کورد و فارس، ڕەش و سپی .. هتد. پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرموێت:**{لَاّ فَرّقِ بّيّنِ عَرَّبِيٍّ وّلَاّ اِعجّميّ ولا أبيض وَلَا أَسْوَدَ اِلَّاّ بّاّلتقوى}**[2]واتە: جیاوازی نیە لە نیوان کەسیکی عەرەب و کەسێکی غەیرە عەرەب وە جیاوازی نیە لە نیوان کەسێکی سپی پێست و ڕەش پێستیکدا ئیلا بە تەقوا نەبێت . تێبگە برای موسڵمان و خوشکی موسڵمان بۆچی تێناگەن لەڕاستی و حەقیقەتی ئەم ژیانە بۆچی هەولنادەی بۆقیامەت توێشیوکۆبکەیەوە تانەچاتت بێ لەسزای خوا خۆتۆ بۆ ڕابواردن نەهاتویە ئەم دنیا کاتی یە بێگومان بەیانی بەجێدێلیت .خوای گەورە دەفەرموێت ئێوەم دروستکردوە تا لەم دنیا تاقیتان بکەمەوە کێ کردەوەی چاکە دەکات و بەهەشت مسۆگەر دەکات، هەروەك خوای پایە بەرز فەرموویەتی:

---

[1] {رواة مسلم}
[2] {متفق علية}

{ الَّـذِي خَلَـقَ الْمَـوْتَ وَالْحَيَـاةَ لِيَبْلُـوَكُمْ أَيُّكُـمْ أَحْسَـنُ عَمَـلًا}[1]. واتە: هەر ئەو خۆی مردن و ژیانی بەدیهێناوە، تا تاقیتان بکاتەوە، کێتان کردەوەی چاکترو پەسەندترە . نەک بۆ ئەوەی خەڵکی خۆیان هەڵبکێشن بە قەومو هۆزو عەشیرەت .بەڵێ موسڵمانی ڕاستگۆ شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوکەسەیە کە جیاوازی ناکات لە نێوان موسڵمانان لەهەموو قەومێك بە بێجیاوازی بە براو خوشکی خۆی ئەزانێت گەر لەو پەڕی شەرق و غەربێت مادام ئیمانداره. { إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ }[2]واتە: بێگومان بەڕاستی ئیمانداران برای یەکترن. کەوایە بۆچی جیاوازی کردن تاکەی ، ئەو قەومەی کە تۆ پێت سوکە نازانی کەسی وای تێدایە بۆ غەیری خوای گەورە بۆهیچ دەسەڵات و کەسێك سەریان نزم ناکەن ئەهلی تەوحید و یەك خواپەرستین .کەوابوو لەخوای گەورە بترسە لە ئێستاوە بەندایەتی خۆت بۆ خوای گەورە بسەڵمێنە کە مرۆڤەکان و گشت قەومەکانی بەجوانترین شێوە دروستکردووە { لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ }[3]. واتە: سوێند بەخوات ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بەڕاستی ئینسانمان دروست کرد لەجوانترین شێوە . کەوایە کە مرۆڤەکان خوای گەورە دروستی کردوونە بۆچی بە سووك سەیریان ئەکەی ئەو کەسەی کەخۆت پێ موسڵمانە ڕەخنە لەو مەگرە

---

[1] الملك . {2}
[2] الحجرات {10}
[3] التين. {4}

بـڕۆ ڕەخنـە لـەخوای گـەورە بگـرە بڵێ ئـەی خوایـە بـۆ وات دروسـت کردوون ! چونکە ئەوقەوم و عەشیرەتانە هەموویان بەتۆشەوە کەس بە وویستی خۆی لەدایك نەبووە . **{وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا}**[1]واتە:خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە بێ ئەوەی هیچ شتێك بزانن، بۆیە ترسی خوا لە دڵت بێت بزانە هەموو کەس حەزی ئەکرد جوانترین و بەناوبانگترین و دەولەمەندرین کەسی دنیا با بـەڵام هیچمـان بـە وویسـتی خۆمـان نەهاتووینـە دنیـا ، بۆیـە بـا بەندەی خوای گەورەبین هەوڵبدەین برایەتیمان توونددو تۆڵتر بکەین بەڕاستی ئێستا کەسی وا هەیە زۆر موسڵمانە ئەهلی مزگەوتە دەڕواتە داوای کچێك بەڵام لەقەومی ترە کەچی خزمەکانی یان باوك و دایکی کچەکە ڕێگری دەکەن لـەوەی شـوو بـەو گـەنجـە بکات بـەس لـە بـەر ئـەوەی قـەومێکی هـەژارن ! بـەڵام گـەنجێکی خوانـەناس بێـت کچی خۆیان بێ دوو دڵی ئەدەن پێ سـەرنجامی کچیان لەگەل کوڕی نـوێژ نەکـەر ئـەبێت . بۆیـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لەفـەرموودەکانی تـەنها ئاماژەی سەرەکی بە دین و ئەخڵاق کردووە نەك قەوم و عەشیرەت ، کـەچی تـاوەکو بێن کچی خۆیـان بـدەن بـەو کوڕە دینـدارە بـا قـەوم و عەشیرەتی وانیش نەبێ بەڵکو لەبەرخوا چونکە ئەو گەنجە خاوەنی ئەخڵاق و ڕەوشتی ئیسلامیە تاوەکو برایەتی نێوان موسڵمانان بتەو بەهێز بێت . پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆرەبەی خێزانەکانی لەقەومە

---

[1] النحل . {78}

جيـا جياكـان بـووه تـا زيـاتر خـەڵك بێنـه نێـو ئيسـلام و خزمايـەتی و پەيوەنـدی و برايـەتی بتـەو بێـت . خـوای گەورە چی بەمرۆڤەكان دەڵێ بەگشتی{**يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَـارَفُوا إِنَّ أَكْـرَمَكُمْ عِنـدَ اللَّـهِ أَتْقَـاكُمْ**}[1] واتـه: ئەی خـەڵكينـه بێگومـان ئـێمه هەمووتانمـان لەنێـرو مێـيەک دروسـتكردووه و كردوومـانن بەچەنـدەها گەل و تيـره و هـۆزی جۆربەجـۆر، تـا يەكتـر بناسـن و پەيوەنـديتان خـۆش بێـت بەيەكەوه بەڕاسـتی بەڕێزترينتـان لای خـوا ئەو كەسانەتان كەزۆرتر لەخواترسەو فەرمانبەرداری خوايە. بۆيە با لەو سـاتەوه لەخـوای گەورە بترسـێن بيـرت بـۆ كـاتێ قيـامەت دێـت ئەوانەی بەقەوم و عەشـرەتيان خۆيـان بەسـەر خـەڵكێ هەڵئەكێشـا بـابزانن قەوم و عەشيرەتيان هەر هەمووی لەپشتی بن لەو كاتی هيچ سودی نيه كەس بەئاگای ناهێت . {**فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِـذٍ وَلَا يَتَسَـاءَلُونَ** }[2]واتە: ئينجـا كـاتێ لـه جـاری دووەمـدا، فـوكرا بەشـەيپوردا ، بۆ زيندوو بوونەوه ئيتر لەبەر قورسيی و نارەحەتی ئەو ڕۆژەيـه، هـيچ نەسـەب و خزمايەتييـەك لەنێوانيانـدا ناخوێنرێتـەوه، چونكـه هەركەسـەی سـەرقاڵ و سـەرگەرمه بـەكاری خۆيـەوەو، پەردەژی نييه، تا ئاوەڕ بەلای خزمەكەيەوه بداتەوه، تەنها كردەوەی چاك و بڕوای چاك كەڵكی دەبێ بۆی و لەيەكتريش ناپرسن، چونكه

---

[1] الحجرات .{13}
[2] المؤمنون {101}

هەریەکـە کـاری خـۆی هەیـە. بەڵێ موسـڵمانی خواوویسـت لە ڕۆژی قیـامەتیش کـاتێ حەشروحیسـاب دەسـتپێدەکات لە بارەگـای خـوای پایەبەرز هیچ شتێکی دنیا لە قەومو عەشیرەت سوودمان پێناگەیەنێ جـگە عەمەل و کاروکردەوەی چـاکە نەبێـت{لَـن تَـنفَعَكُمْ أَرْحَـامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ يَـوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ }[1] واتـە:هـەرگیز نـە خزمانتـان و نـە منــدالانتان ســوودتان پێناگەیــەنن و فریاتــان ناکــەون، لــەرۆژی قیامەتـدا ، کـە ئێـوە لـە بـەر ئـەوان دۆسـتایەتیان دەکـەن لـەرۆژی قیامەتـدا خـوا لێکتـان جیـا ئەکاتـەوە(بڕوادارو بێ بڕوا)هەرکەسـە ئـەنێرێ بۆجێگـای شـیاو بـەخۆی ئەگـەرچی کـەس و کاریشـتان بـن.
لەڕۆژی دوای خـوای گەورە سـەیری قەومـو هـۆز و پلەو پـایە ناکات ، کە ئەوانـەی دنیـا خۆیـان بەعشیرەتیان بەسـەر خـەڵك گەورە ئـەکرد بابزانن کە خوای پایە بەرز سـەیری دڵ و کردەوەکانت دەکات داخۆ چەن بۆخــوا ژیاویــت لەدنیــایی فــانی . پێغەمــبەری نــازدار(ﷺ) دەفەرمووێ {إِنَّ اللَّهَ لا يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ وَإِنَّمَا يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَـالِكُمْ}[2]واتە. خـوای گەورە سـەیری سەرشـیوەو ویناتـان و مـال و مولكتان ناکات بەلکو سەیری دلتان و کردەوەکانتان دەکات . سـەیری دل واتە بزانی دلتان حەسودی و دووڕویی و گومانی خراپی تێدایەیان بە پــێچەوانەوە دڵێکــی ســاغ و ســەلیم و لەخواترســە ســەیری

[1]الممتحنة {3}
[2]{رواة مسلم}

سەروسـیما ناكات واتە سەروسـیمای جـوان و بـاڵاو هەیكەلی نایـاب مـرۆڤ خۆشەویسـت ناكـات لای خـوا و پێی نـاچیتە بەهەشـت وە سـەروەت و سـامانیش بەهەمـان شـێوە مەگەر لەپێنـاو خـوادا ببەخشـرێت . كەوایە زانیمـان بـۆ هـاتوینە دنیـا تـاوەكو تـاقیبكرێینەوە بۆدنیاكەی تر كەقیامەتە نەک بۆئەوە هاتبن تا بە هۆزو قەوم خۆمان بەسـەر خەڵكانی تـر بسـەپێنین . كەوابـوو تـاكو زووە بابەنـدەی الله بین تالەقیامەت سەرفرازبین .

**مرۆڤەكان خوای گەورە دروستی كردوونە بۆچی بە سووك سەیریان ئەكەی ئەو كەسەی كەخۆت پێ موسڵمانە ڕەخنە لەو مەگرە برۆ ڕەخنە لەخوای گەورە بگرە بڵێ ئەی خوایە بۆ وات دروست كردوون !چونكە ئەوقەوم و عەشیرەتانە هەموویان بەتۆشەوە كەس بە وویستی خۆی لەدایك نەبووە.**

# ساتێك لەگەڵ قورئان

قورئـان بریتییـە لـەو وتـەو گوفتارانـەی خـوای پـەروەردگار بۆسـەر پێغەمبـەری کۆتازەمـان دایبەزانـدووە. قورئـان جیاکـەرەوەی حـەق و باطلە! قورئان حـەقی سەرخست بەسـەر باطل، کـە قورئـان دابـەزی ناحـەق وبـەتاڵ لـەناوچوو وشـك بوویـەوە لەشـوێنی خـۆی چونکـە شـەیتانی لەپشـت بـوو. هـەر ڕێچکـەو ڕێبازێـك شـەیتانی لەپشـت بـوو، ئەوا ناتوانێت بەسـەر حـەق سـەر بکـەوێ لەشـوێنی خـۆی ئەپوکێتـەوە {وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا}[1] واتـە: هـەروەها ئەی پێغەمبەر(ﷺ)بڵێ: تازە حەق و ڕاستی هاتووەو بەرپا بووەو بەتاڵ و ناحـەق، پـووچ و تـەفرو توونـا بـووە، بەڕاسـتی ناحـەق و بـەتاڵ هــەرتیاچووەو جێگــیر نــەبووەو بەزیووە.ئــەم قورئانــە مرۆڤــەکان لــەژیانێکی هەڵــدێر و رووخێنــەری دڵــەکان دەبــات بــەرەو ڕێگــای سـەرکەوتن و ژیـانێکی پـڕ لەخۆشـی و دوور لەهـەر ناخۆشـییەك کـە پێشـتر هـەت بوو،قورئـانی پیرۆز بـۆ ئـەوە دابـەزیوە کـە چارەسـەری هەموو دەردو بەڵاوموسیبەتێك بێت و ببێتە شیفای دڵە نەخۆشەکان بۆ ئیمانداران بەتایبەت ئەوانەی موسڵمانی ڕاستەقینەن!

---

[1] الأسراء . {81}

**{يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ}**[1]واتە:ئەی خەڵکینە، بەڕاستی ئێوە ئامۆژگارییەکی گەورە و گرنگتان لە لایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە کە قورئانە شیفا و چارەسەریشە بۆ نەخۆشی دڵ و دەروونەکان و ڕێنیشاندەرو ڕەحمەتیشە بۆ ئیمانداران. دەبێت ئینسانەکان ئەوە بزانن کە ئەم قورئانە ئەمانەتە، خوای گەورە ئەمانەتێکی زۆر گەورەو قورسی داوە بە مرۆڤەکان، کە هیچ شتێك ئەو ئەمانەتەی لەئەستۆ نەگرت جگە لەئینسانەکان.**{إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا}**[2] واتە: بێگومان ئێمە سپاردەمان نیشانی ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان دا بەڵام هیچیان ڕازی نەبوون کە هەڵیگرن و ترسان لەو ئەمانەتە کەچی ئادەمی ئەو سپاردەی هەڵگرت بەڕاستی مرۆڤەکان زۆر ستەمکارو نەزانن. بەهۆی قورسی و گەورەی ئەمقورئانە پیرۆزە گەرهاتباو ئەو ئەمانەتە بۆسەر چیاکان هاتبایە خوارەوە ئەوا پارچە پارچە ئەبوون لەترسی خوای پەروەردگارو گەورەیی ئەم قورئانە!
**{لَوْ أَنْزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُتَصَدِّعًا مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ}**[3]واتە: ئەگەر ئەم قورئانەمان داببەزاندایە سەر کەژو کێوێك، دەتبینی ملکەچ دەبوو، وردو و خاش دەبوو، شەق و پەق دەبوو، لە

---

[1]یونس . {57}
[2]الأحزاب . {72}
[3]الحشر . {21}

ترسی فەرمانی خوا، لە هەیبەتی گەورەیی و دەسەڵاتی خوا.بەداخەوە بۆمرۆڤەکان کەئەم قورئانە پیرۆزەیان لەبیرکردووە کاری پێ ناکەن. لەدادگاکانـدا تـۆزی لەسـەر نیشـتووە تـەنها بۆسـویندخواردن بـەکاری دێـنن و حـوکمی پـێ ناکـەن! بـەڵکو کار بەیاسـای دەسـکردی هـەواو هەوسـی کـوفر ئەکـەن .ئـەی موسـڵمان بیربکـەوەهەموویاسـایەکی دەسـکردی مـرۆڤ مـان تاقیکردەوەبابۆیـەك جـاریش یاسـای قـورئـان تاقیبکەینـەوە ئـەوجابۆمـان دەردەکـەوێت کامـەیان خوشـبەختیمان پێدەبەخشـیت بـەلام ولامەکەئاشـکراو ڕوونـە بۆنمونـە: ئایـا لـەمانگی رەمـەزانی پیرۆزنـابینن چ ئـارامی وخوشـی وبرایەتیـەك بـەرپادەبێت خوئەوەجێبـــەجێ کردنـــی یـــەك ئایـــەتی حـــوکمی قورئانـــە، باشـەئەگەرقورئان هـەرخۆی حـاکم ودادوەربێـت دەبێـت چ ژیانێـك لـەبونـەوەر بگوزەرێـت!لـە کاتێکـدا خـوای پـەروەردگاریش ئـەمری پێکردووین لەهەر کێشەو گرفتێکدا بگەڕێنیەوە بۆ قورئان و سوننەت { **فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ** }[1]واتـە: خـۆ ئەگـەر لـە شتێکدا بوو بەکێشەتان دەربارەی حوکمی خوایی، ئەوە ئەو کێشـەیە بگێڕنـەوە بـۆ لای خـواو پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) (کـە قـورئـان و سـوننەت دەگـەیـەنێت) . بۆئەوە ئەمرمان پێکراوە کاربـە قورئـان بکـەین تـاوەکو گومڕانـــەبین ، چونکـــە ئـــەم قورئانـــە ڕۆشـــنکەرەوەی ڕێگـــای ڕاستەقینەیە. لـەم رۆژگارەی غوربەتداموسڵمانەکان قورڕئانیان لەیاد

[1]النساء . {59}

كــــــردووەبەڵام نــــــاتوانن شــــــتێكی دنیــــــای لەبیــــــر بكــــــەن بۆساتێكیش،قورئانەكانیان لەژێر تەلەفزیۆنەكانیان داناوە لەكاتێكدا گـەورەترین كتێبی سـەر ڕووی زەوییـە! یـان بـەدیواری ماڵـەكانیان هەلواســیوە بــۆ پیــرۆزی بەڵام ئامــادەنین بۆســاتێكی كــەمیش بیخوێننـەوە! گـەر بـەو جـۆرە كەسـانە بڵێی بـۆ قورئـان نـاخوێنی ئـەوا گاڵتـەت پێ دەكـەن و گوێ نـادەن بـەو قسـەیە بەڕاسـتی ئـەم جـۆرە كەسـانە خەسـارەت مەنـدی دوا ڕۆژن.**{الَّـذِينَ آَتَيْنَـاهُمُ الْكِتَـابَ يَتْلُونَـهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ أُولَئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ وَمَنْ يَكْفُرْ بِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ}**[1] واتە: دەسـتەیەک لەوانەی كە كتێبمـان پێ بەخشـیون قورئـان بەچـاكی و بەوردی دەوری دەكەنەوە، ئەوانە باوەڕیـان پێـی هەیەو بـاوەڕی پـێ دەهێـنن، بەڵام ئەوەی بـڕوای پێی نەبێـت، ئـا ئەو جـۆرە كەسـانە لە خەســــارەتمەندو زەرەرمەنــــدەكانن. لــــەڕۆژی دوایــــدا هــــەموومان بەرپرسـیارین لـەو ئەمانەتـەی خـوا پێـی دابـووین لەكاتێكـدا لـەدنیا فەرامۆشـمان كردبـوو. پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)سكاڵامان لێ دەكات لای خوای گەورە لەڕۆژی دوایی لەسەر ئەم قورئانە!**{وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَـوْمِي اتَّخَـذُوا هَـذَا الْقُـرْآَنَ مَهْجُـورًا}**[2]واتـە: پـەروەردگارا بەڕاسـتی قەومەكـەم وازیـان لـەم قورئانـە هێنـاوە و پشـت گوێیـان خسـتووە و گرینگی پێ نـادەن. بـەڵێ لـەڕۆژی دوایـی هـەموومان لێپرسـینەوەمان

[1] البقرة . {121}
[2] الفرقان . {30}

لەگەڵ دەكرێت لەسەرئەوەی قورئان غەریب بوو لەنێوماندا هیچ گرنگیمان پێ نەئەدا، نەماندەخوێندەوە كارمان پێ نەئەكرد، گوێمان بەرامبەری كەڕ كردبوو دڵەكانمان قوفڵدرابوو لەڕاستی ئەم قورئانە!{أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا}[1]واتە: ئایا ئەوەبۆچی ئەوانەوردبینی لەقورئاندا ناكەن و گوێی بۆ ناگرن؟! یان ئەوەیە دڵەكان لەئاستی ڕاستیدا قفڵ دراون؟!ئەی ئەو كەسانەی ماوەیەكە پشتان لەقورئان كردووە وازتان لێ هێناوە بەسە بگەڕێنەوە بۆسەر قورئان دڵەكانتان ئاوبدەن بەو قورئانە چونكە ماوەیەكە وشك بووە بەهۆی لەبیركردن وگوێ پێ نەدان! بەڵێ هەرئەو قورئانەیە لە ڕۆژی دوایی شەفاعەت بۆ خاوەنەكەی ئەكات كە لەدنیای كاتێ دەوری كردۆتەوە وازی لێ نەهێناوە تاكو كۆچی كرد لەدنیا بۆشوێن و مەنزڵگای دووا ڕۆژ!هەروەك پێغەمبەری نازدار(ﷺ)دەفەرمووێ: {اقْرَءُوا الْقُرْآنَ فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعًا لأَصْحَابِهِ}[2]واتە: قورئان بخوێنن چونكە لەڕۆژی دوایی دا تكاكارە بۆ خاوەنەكانی. ئەی برا وخوشكانی بەڕێزم گەر دەتەوێ لەم ڕۆژگارەی پڕ لەفیتنە ژیانێكی خۆشت هەبێ، گەر دەتەوێ گومڕا نەبی، توشی فیتنە نەبی، ئەوا دەست بەم قورئانەوە بگرە، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ)ئاگادارمان دەكاتەوە دەفەرمووێت:

---

[1] محمد . {24}

[2] {متفق علیه}

**{ تَرَكْتُ فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوابَعْدَهُمَا: كِتَابَاللَّهِ وَسُنَّتِي }**[1] واتە: دوو شتم لە ناوتاندا بەجێ هێشتووە ئەگەر دەستی پێوە بگرن گومڕا نابن: قورئانەکەی خوای گەورەو سوننەتەکانی من. بەڵێ ئەم قورئانە ڕێگا ڕۆشنکەرەوەی مرۆڤەکانە لەدنیا، لە گومڕایی و نەزانی بۆ هێدایەت و خۆشبەختی بۆئەوەی لەقیامەت بەباشترین شێوە پاداشت وەربگرنەوە. **{إِنَّ هَذَا الْقُرْآَنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَالصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا}**[2].واتە: بەڕاستی ئەم قورئانە هیدایەت بەخشە بۆ چاکترین ڕێگەو ڕێبازو بەرنامە، مژدەش دەدات بەو ئیماندارانەی کە کاروکردەوە چاکەکان دەکەن کە بێگومان پاداشتی زۆرو بێ سنوور چاوەڕێیانە. ئەمرمان پێ کراوە لەلایەن خوای تعالی بەدوای ئەم قورئانە بکەوین **{ وَاتَّبِعُوا أَحْسَنَ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم}**[3]واتە: شوێن چاکترین شتێ بکەون کە نێردراوەتە خوارەوە بۆتان لە پەروەردگارتانەوە کە قورئانە . خوای گەورە بۆئەوە ئەمرمان پێ دەکات بەدوای بکەوین چونکە ڕێنیشاندەرە لەگومڕای بۆخۆشبەختی و هیدایەت**{ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ}**[4]واتە: ڕێنیشاندەری بۆ ئەوکەسانەی لەخوا ترسن . گەر پشتمان لێ کرد و بەگوێ ی فەرمانی خوامان نەکرد ئەوە پەشیمانی دادمان نادات لەقیامەت

---

1 {متفق عليه}
2 الأسراء. {9}
3 الزمر . {55}
4 البقرة . {2}

چونکه خوا فەرمانی کرد کەواز لە قورئان نەێنن پێش ئەوەی گومرا ببـین ، پـێ ڕاگەیانـدین کەبەدوای بکەویـن . دواتـر نەوەک کەسـی گوناهبارلەقیـامەت بلێـت ئەی خـوایە بۆپێـت نەوتم بەدوای قورئـان بـکەون ، هـەروەك خـوای پـەروەردگار لەسـەر زمـانی ئـەم جۆرەکەسـانە دەفەرمووێت:{ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَا حَسْرَتَا عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنبِ اللَّهِ وَإِن كُنـتُ لَمِـنَ السَّـاخِرِينَ}[1]واتە. نەوەکـو یەکێـک بلّێـت: ئـاخ و داخ و پەشیمانی بۆ ئەو هەموو لادان و نادروستیانەی کە کردم، لە فەرمان و بەرنامەی خوادا، بێگومان لەو کەسانەش بووم کە گاڵتەیان بەدین و بەرنـامەی خـوا دەکـرد . بۆیـە ئـەی بەنـدەکانی خـوا لـەئێسـتاوە تـا دواساتی تەمەن بڕیار بدە بۆ خۆت واز لەهاوڕێی دنیایی بێنە کەهیچ سوودی نیە بۆت. قورئان بکە بەهاوڕێت کەچاکترین پشت و پەناتە هەم لەدنیا و پاشان قیامەت. گەر دەتەوێ بەشادی و کامەرانی بژی لەهەردوو دنیا ڕوو لەقورئان بکە.

**ئەی برا وخوشکانی بەڕێزم گەر دەتەوێ لەم ڕۆژگارەی پڕ لەفیتنە ژیانێکی خۆشت هەبێ گەر دەتەوێ گومڕا نەبی، توشی فیتنە نەبی ئەوا دەست بەم قورئانەوە بگرە**

[1] الزمر . {56}

# ڕاستگۆیی

یەکێك لـە سیفات و ئاکارە جوانەکانی ئیسلام بریتییە لە ڕاستگۆی ، کـە مرۆڤ لـە کۆمـەڵگا بـەچاوی ڕێـزو خۆشەویستی سـەیری ئەکـەن گەر هاتوو ڕاستگۆ بوو . بۆیە خـوای گـەورە ڕوو لە ئیمانداران دەکات و ئاماژە بۆ ئەو ڕەوشـتە بـەرزە دەکات کە لـە خۆیـان بێننـە دیٚ و ببن بەیەکێك لـە کۆمەلەو دەستەی ڕاستگۆکان. **{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ}**[1]واتە: ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن و پارێزکار بن، هەوڵ بدەن هەمیشە لەگەڵ ڕاستگۆیان و ڕاستاندا بـن . هـەموو کـات دەبێ موسـڵمان هەسـت بـەچاودێری خوای پەروەدگار بکات کەبزانێت ئاگادارە بەنهێنی ئاشکراو پەنهانی دڵ و گوفتـار. **{وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنْفُسِكُمْ}**[2]واتـە: بەڕاسـتی خـوا دەزانێت بەوەی کـە چی لـە دڵ و دەروونتاندایە . بـەڵێ گـەر موسلمان هەستی بەترسـی خـوای گـەورە کـرد گـەر بەڕاسـتگۆی نـەبێت قسـە ناکـات ، ئەمـەش نیشـانەی موسـڵمانی ڕاسـتگۆ و شـوێنکەوتەی پێغەمبـەری نـازدارە(ﷺ) .نەکـە بـۆ مەسلەحەتی دنیـایی لـە مـەدریس و نێو خەڵکی بەبێ گوێدانەئەوەی کەقسەکانی ڕاستن یا نە خۆی دێنێتە

[1]التوبة . {119}
[2]البقرة . {235}

پێش تا بڵێن قسە زانە یا خۆی باش دەکات لەبەرچاوی خەڵك ، بۆیە خوای پایە بەرز ئامۆژگاریمان دەکات کەقسەی چاك و بەسوود بکەین {**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا**}[1] واتە : ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن و پارێزکاربن، هەمیشە قسە و گوفتاری بەجێ و بەسوود بکەن. بۆیە گەر هاتوو کەسێك بەدرۆزن بناسرێت لە کۆمەڵگا زۆر سوك و بێڕێز ئەبێت خەڵکی هەموو خۆیان دەپارێزن لێی بەڵام بەپێچەوانە گەر هاتوو ڕاستگۆ بوو خەڵکی هەموو خۆشیاندەوێت ، بۆیە ئەی بەندەکانی خوا باهەموو کات هەوڵبدەین ڕاستگۆبین لەگەل خوا پاشان لەگەل خەڵکی . باڕاستگۆیی بکەین بە ئامانج لە ژیانمان لەگەل دەورووبەرمان لەگەل دایك و باوکمان ، دراوسێمان ،هاوڕێکانمان،لەگەل کۆمەڵگا یان لەگەل ئیسلامەکەمان نەك بۆ مەبەستی دنیایی و ڕازیکردنی عەلمانیەکان ئیسلام بەدڵی وان بگەیینن بەخەڵکی لەکاتێکدا دەزانین هەڵەیە و ناراستە بەڵام لەترسی گرتن و بڕینی موچە حەق و ڕاستی بشارینەوە .

[1] الأحزاب . {70}

{وَلَا تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُوا الْحَقَّ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ}[1] واتە:نەكەن ڕاستی و بەتاڵ، حەق و ناحەق بەیەكەوە بئاڵێنن و حەق مەشارنەوە، درۆ دامەپۆشن بەڕاست لەكاتێكدا خۆشتان حەق و ڕاستی دەزانن كامەیە. بۆیە خۆش بەختی بۆئەوانەی تەنازول ناكەن لە حەق و ڕاستی لەهەر شوێنك بوو ڕاستی و حەق ڕوون دەكاتەوە بەڕاستی ئەم موسڵمانانە سەر كەوتوون .{وَالَّذِي جَاءَ بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ ۙ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ}[2] واتە: ئەو كەسەش ڕاستی و حەقیقتی هێناوەو باوەڕیشی پێیەتی، تەنها ئا ئەوان خواناس و دیندارن . خوای پەروەردگار ئەو كەسانەی خۆشدەوێ كە ڕاستگۆن لە ووتەو كردار ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: {أَحَبُّ الْحَدِيثِ إِلَيَّ الله أَصْدَقُهُ}[3] واتە: خۆشەویسترین قسەو گوفتار لای خوا ڕاستگۆترینیانە . بەڵێ براوخوشكانی بەڕێز سیفات و ئاكاری ڕاستگۆیی موسڵمان بەرەو بەهەشت دەبات . پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) دەفەرموێت : {إِنَّ الصِّدقَ يَهْدِي إِلَى البرِّ، وإِنَّ البر يَهدِي إِلَى الجَنَّةِ}[4] واتە: بەڕاستی راستگۆیی ڕێنمونیت دەكات بۆ چاكە، وە چاكەش ڕێنمونیت دەكات بۆبەهەشت

[1] البقرة . {42}
[2] الزمر . {33}
[3] {رواه البخارى}
[4] {متفق عليه}

بۆیە با هەوڵبدەین هەمیشە ڕاستگۆبین لە ژیان تا لەقیامەت سەرکەوتن بەدەست بێنین بەهۆی ڕاستگۆیمانەوە . {**قَالَ اللَّهُ هَٰذَا يَوْمُ يَنْفَعُ الصَّادِقِينَ صِدْقُهُمْ ۚ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۚ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ۚ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ**}[1]واتە:(ئینجا) خوای گەورە فەرمووی: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە ڕاستگۆیان ڕاستگۆییەکەیان سوودیان پێدەگەیەنێت، باخەکانی بەهەشت بۆیان ئامادەیە کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات و بۆ هەمیشەو هەتاهەتایی لەو بەهەشتەدا دەمێننەوە و خوای پەروەردگاریش لێیان ڕازی بووە و ئەوانیش لە خوا ڕازی بوون، ئەوەیە سەرفرازیی گەورە و بێ سنوور. کەوایەبا هەردەم ڕاستگۆبین تا ئەو پاداشتە گەورەیە لەدەست نەدەین بەهۆی خۆشی وڕابواردنی کەمی ژیانی ئەم دنیا کاتییە.

**با ڕاستگۆیی بکەین**
**بە ئامانج لە ژیانمان**

[1] المائدة . {119}

# باوەشكردن بە دنیاو پشتكردن لەقیامەت

سـەیرەلەمرۆژگارە كەواموسـڵمانان كاروكردەوەیـان تـەنها بـۆ دنیایـە . خواپەرستن یان نوێژ و ڕۆژو و هەمووشتێك بۆ ئەوەدەكەن تاكوبڵێن بەڕاسـتی خواپەرسـتێكی چاكـە. وانابێـت بـرا و خوشـكانی موسـڵمان بابچینەخزمـەت قوڕئـانی پیرۆز،خـوای گەورەدەفـەرموێت:**{قُـلْ إِنَّ صَـلَاتِي وَنُسُـكِي وَمَحْيَـايَ وَمَمَـاتِي لِلَّـهِ رَبِّ الْعَـالَمِينَ}**[1] واتــە: ئــەی پێغەمبـەر(ﷺ) بڵێ بێگومـان نـویژو بەندایـەتی وژیـان و مـردنم تـەنها بۆخـــوای پـــەروەردگاری هەمووجیهانیانـــــە. بەڵـــێ : دەبێـــت هەمووكاروكردەوەیەكت بۆخوای پەروەردگار بێت گەر بۆ خوانەبێت ئەوافاشـلە وە قبوڵنیەلـە لای خـوا !! خوایگەورەدەفـەرموێت: **{وَمَـا خَلَقْـتُ الْجِـنَّ وَالْإِنْـسَ إِلَّا لِيَعْبُـدُونِ}**[2]واتـە:ئێمـە مـرۆڤ وجنـەكان مـان دروستكردووە تەنها بۆئەوەی من بپەرستن. مەبەست لەپەرستن واتە جێبەجێكردنی فەرمانەكانی لەقوڕئان و فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ). بۆیـە دەبێـت ژیـان ومردنمـان بۆخزمـەتی دینی ئیسـلام بێـت بـۆ ڕەزامەنـدی خـوا. بـە داخـەوە بـۆ هەنـدێك مرۆڤی ئـەم ڕۆژگارە كـەوا بەس بەدوای دنیاكەوتوون ئاگایان لەئیسلامەتی نەماوە ئاواتەكانیان

[1] الأنعام . {162}
[2] الذاريات . {56}

لەژیانی کورتی دنیا بەس ژنی جوانە یان بیکەن بەدوو یان زیاتروخواردنی خۆشیان هەبێت یان سەیارەی مۆدیل بەرز ...هتد. ئیسلامەتی لای ئەمانە تەنها ژن وخواردنی خۆش وڕابواردنە! پێغەمبەری نازدار(ﷺ) باسی ئەو هۆکارەی کردووە کەدەبێتە هۆی دوورخستنەوە لەدین کەڕووکردنە لەخۆشییەکانی دنیا { **إِنَّ مِمَّاأَخَافُ عَلَيْكُمْ من بَعْدِي مَايُفْتَحُ عَلَيْكُمْ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا وَزِينَتِهَا** }[1]واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمویەتی: ئەوەی لەدوای خۆم دەترسم توشتان بێت ببێتەمایەی دورخستنەوەتان لەدینەکەتان خۆشی وڕازاوەیی ئەم دنیایەیەکەزۆرکورتەوبەخێرایي شدەبڕێتەوە. بۆیەبێ ئاگان کەواڕۆژێکدێت مردن بەرەودنیای ئەبەدیاندەبات. ئەمانەئەزانن کەواڕۆژێکدێت ئەمرن بەڵام ئەمجۆرەکەسانە غەرقی هەواو ئارەزووی دنیابوونە بۆیە وایان لێهاتووە کە ڕۆژی دواییان بیرچۆتەوە. بۆیە تا کو مردن یەخەینەگرتووین برای موسڵمان خوشکی سەنگینم بیربکەوە بەو کەسانە هەڵمەخەڵەتێ کەوا بۆدنیایی کاتی ئەژین وازیان لە دنیایەکەی تر هێناوە کە بەنرخترە!

[1] {متفق عليه}

**{وَمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ وَإِنَّ الدَّارَ الْآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ}**[1] واتە: ئەم ژیانەی دنیا تەنها رابواردنێكی بێ هودە و یاری منداڵانە، وەهەرچی ژیانی ڕاستەقینە یە هەمیشە ییە ژیانی ئاخیرەتە ئەگەر بزانن! بۆیە وا مەكەن ئاخیرەت لە دەست بدەین هەردەم بیرت بالای مردن بێت،چونكەمردن بەسەبۆئامۆژگاری! لەم ڕۆژگارەی غەریبیەدا زۆر بەی موسڵمانان بەرەو لە ناوچوون ئەچن بەهۆی ئالودە بوون بە خۆشی دنیاو هەواو ئارەزوو خواپەنامان بدات. ئەی برایان وخوشكانم با تۆزێك بەئاگابێینەوە بۆئەوەی لە كەسانێك نەبین تەنها هی دنیایی كاتین،**{يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ}**[2] واتە: تەنها شارەزای ژیانی دنیان بەڵام بێ ئاگان لە رۆژی دوایی. باتوێشوو بۆقیامەت بەرێ بكەین تاكو بەهەشت بەدەستبێنین. بەڵام لەم ڕۆژگارە خۆشیەكانی دنیا وای كردووە كە موسڵمان هەموو كارێكی تەنها بۆ دنیا بێ هەروا گومان دەبەن ژیان بەسەر بردن لە دنیا بۆ یەكجارییە بۆیە بەس بۆ ڕابواردن و پشتكردن لە بەرنامەكەی خوا دەژین

---

[1] العنكبوت . {64}
[2] الروم . {7}

{أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ}[1] واتە: ئایا گومانتان وادەبرد کە بە ڕاستی ئێمە ئێوەمان بە بێ مەبەست دروست کردووەو ئێوە بۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە؟!جا ئەوەی گرنگە لەم ژیانە کۆکردنەوەی تێشووە بۆ دنیای ئەبەدی کە قیامەتە . تۆ ڕێبواری دەتەوێ بڕۆی بۆشارێکی دوور گەڕهاتوو شتی پێویستت لەگەڵ خۆت نەبرد بۆ ئەم سەفەرە وەک: ئاو خواردن ..هتد بێگومان لەڕێگادا نەجاحەت نایەنیت بەهۆی دووری ڕێگاکە و برسیەتی و تێنوییەتی ، توشی ناخۆشی و نارحەتی و ماندوو بون و تیاچوون ئەچی ، جابرا و خوشکانی بەڕێزم تۆش لە دنیا هەروەک ئەم ڕێبوارەی کەسەفەرێکیت لە پێشە دەبێ بێگومان کۆچی بۆبکەی کە قیامەتی نەبڕاوەیە . باشترین خۆراک و خواردنەوە بۆئەم سەفەرە کۆکردنەوەی تێشووە کە بریتیە لە خواترسان و چاکەکردن . {وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَىٰ وَاتَّقُونِ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ}[2] واتە: بەردەوام هەوڵ بدەن کە زەخیرەو توێشوو هەڵبگرن بێگومان چاکترین زەخیرەش تەقواو پارێزکاریە، بەردەوامیش لە من بترسن ئەی خاوەن بیرو هۆشەکان .کەس قەدری دنیا نازانێت جگە کەسانێکی

---

[1] المؤمنون . {115}
[2] البقرة .{197}

لەخواترس چونکە باش لەدنیا گەیشتوە ، پاشان مامە حاجی یەکێ پیر کە سەرو ڕیشی سپی بوە ! کە کاتی خۆی گەنجی مەیدان بوو لە جـوانی ناوبانـگ دەولەمەنـدی مـاڵ و منـدال لـەهیچی کـەم نـەبوو ، بەڵام دنیا ڕۆژبەڕۆژ ڕۆژگاری بەجێدەهیشـت بەڵام مامە حاجی بێئاگا بـوو ، هـەر بەخۆشی و جـوانی و ناوبـانگی نازو فیزی دەکـرد وازی هێنـا بــوو لــە فەرمانــەکانی خــوای گــەورە نــوێژ،ڕۆژوو ..هتــد جاتــاوەکو گەیشـتە ئەم ڕۆژگارەی پیری و پەکەوتەی . بۆیە هەرکەس ویستی بە نمونـە خۆشـییەکانی دنیـایی بـۆڕوون بێتـەوە بابچێتـە لای ئـەم مامـە حاجیـە کـەمێ باسـی حـالی خـۆی بۆبکـات کەچـەن خۆشـی دیـوە لـەوەڵامی مامـە حـاجی بـۆت ، کوڕی خـۆم : مـن وا ئێسـتا تەمـەنم بـۆ هەشتاکان دەڕوات بەڵام ئەو تەمەنەی بەڕێمکرد لەخۆشی و ڕابواردن هـیچ نـەبوو کەهەسـتی پێبکـەی سـاتێکی کـەم نـەبێ ئـەویش هـەموو ڕۆیشت ! ئێستاش واتێدام ناوەستێ دەڕوات  بۆیە ئەی کوری شرینم وریابە ژیانی دنیا هەلت نەخەلەتێنت.ئەی کورە ژیرەکەم بزانە ئەوەی لای خـوای گەوەرەیە باشـترو نەبڕاوەتـرە لەم ژیـانەی دنیـا ، ئەوەی دێتە دەستت لە ماڵ ، پارە ، سەروەت ، ژن ، ناوبانگ ، دەسەڵات و سوڵتە، جوانی ..هتد هەمووی دەڕوات .

{فَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا}[1] واتە: ئینجا هەر شتێك بە ئێوە بەخشراوە، لەزەت و بەهرەی ژیانی ئەم دنیایەو، زۆر بەزوویی ئەڕوات و نامێنێتەوە ، بەڵێ ئەی كوڕەنازادارەكەم ئاگاداربە ئەوتەمەنە ناسكەت لەژیانی دنیا تەنها بۆ ڕەزامەندی خوا سەرفی بكە دڵنیابە خوای پەروەردگار باشترین شوێە پاداشتت دەداتەوە ، {وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ}[2] واتە:ئەو پاداشت و بەخششەش لای خوایە بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، وە بە پەروەردگاریان پشت ئەستوورن ، باشترو پایەدارترە. بەڵێ ئەی براو خوشكانی بەڕێزم باش بزانن ئەم ژیانەی دنیا لەچاو قیامەت هیچ نیە هەربۆیە ئەوكەسانەی پشتیان لەبەرنامەی خوا كردبوو ، غەرقی و هەواو هەوسیان ببون هەموو ئامانجیان ژیانی دنیا بوو ، لەقیامەت سوێند دەخۆن كەلەدنیا هیچ نەژیاون تەنها چەن ساتێكی كەم نەبێ .(وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ كَذَٰلِكَ كَانُوا يُؤْفَكُونَ)[3] واتە : ئەو ڕۆژەی كە قیامەت بەرپا دەبێت تاوانباران سوێند دەخۆن كە: بەدەرلەساتێك نەماونەتەوە لە دنیادا هەر ئاواش بوو لەدنیادا لا دەدران لە هەق، بۆ ناهەق و باتڵ. بەڵێ لەژیان بوون

---

[1] الشوری . {36}
[2] الشوری . {36}
[3] الروم . {55}

ڕێگای خـوای گەورەیـان وونکردبـو بەهـۆی خۆشویسـتنی ژیـانی دنیـاو غافل بوون پێوە. مرۆڤ زۆر سەیرە هەموو هەوڵێکی تەنها بۆ ژیانی دنیایە ، چونکە دنیا لەبەر دەستیەتی ژن ، سەیارە ، پارە ،خواردنی خۆش ..هتد لەهیچی کەم نیە . بۆیە هاتنی قیامەت بەدوور دەزانێت کارو کردەوەی بۆ کۆناکاتەوە بەهۆی ڕابواردن و خۆشییەکان .{إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا}[1]واتە:بەڕاستی ئەوانە قیامەت بەدوور دەبینن بەدووری دەزانن. بەڵێ بەدووری دەزانێت دەڵێت بابۆخۆمان جارێک ڕابوێرین خۆدنیا خراپ نابێت تازە گەنجین ، کەچی لەڕاستیدا هاتنی قیامەت زۆرنزیکە .{وَنَرَاهُ قَرِيبًا }[2] واتە:ئێمەش، زۆر بەنزیکی دەزانین (چونکە خوا خۆی بەدیهێنەری کاتە). بەلام موسڵمانی ڕاستگۆ و شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەزانن ڕۆژێک دێت دەگەڕێنەوە بارەگای خوا بۆ لێ پرسینەوە لەو کارو کردەوەی کە کردوویانە. {فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ}[3]واتە: سوێند بەپەروەردگارت ئەی موحەممەد! (ﷺ) لەهەمووان دەپرسین. بەڵێ بۆیە خەمی دنیای نەبوو وەک ئەمانەی تر کە قیامەتیان بەدوور دەزانی، دەیزانی پرسیار لەهەموو ئەو کارکردەوەی دەکرێ لەڕۆژی لەدایک بوونی تا دواساتی تەمەنی.

[1] المعارج . {6}
[2] المعارج . {7}
[3] الحجرات . {92}

**{عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُـونَ}**[1]واتە:لەو کاروکردەوەیە دەیانکرد. کەوایـە بـا لـەو سـاتەوە بڕیاربـدەین بادلەکانمـان خـاوێن بکەیـنەوە لە ژەنگـی تـاوان کەبـۆتە هـۆی تورەبـوونی خـوا لێمـان .ئەوجـا ئەی بەنـدەکانی خـوا بالەئێسـتاوە مەردی خـوابین ئەوتەمەنەی بەڕێمـان کـردوە کە لەبێ فەرمـانی خـوا بەسـەر مـان بـردووە بـا لەئێسـتاوە کە چەن سـالێک تەمەن مان ماوە تـامەرگ نەبۆتە میـوان قەرەبووی بکەینەوە بەخـوا پەرسـتی چـونکە ژیـان بەسـەربردن یەکجـارە جـارێکی تـر نـاتوانی بگەڕێیەوە بۆ دونیا بۆیەئەم جارەش بکەین بە قوربانی رێگای خوا ، بۆخـوا ژیـان بکەیـنە ئامـانج تـا خـوای پەروەردگار پێمـان ببەخشـێ خەلاتە نەبڕاوەکەی کەبەهەشتە.

---

[1] الحجرات . {93}

## چاكەكردن لەگەڵ دایك و باوك

دەبێ منداڵیش ئەوە بزانێ كە چاكەكردن لەگەڵ دایك و باوك باشترین كردەوەیە ناتوانن چاكەیان بدەنەوە بەتایبەت دایك كەڕەنج و ماندووبوونێكی زۆری كێشاوە تا گەورەی كردووی، هەر لەناو سكیەوە تاكوو بووی و گەورەی كردووی بەخەم و خەفەتێكی زۆرەوە، ئەوجا ئەی منداڵی ژیر لەسەرت پێویستە زۆر لەگەڵیان چاكبی. هەروەك خوای گەورە لەقورئان باسی دەكات لە زۆر شوێندا:{ وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّاتَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ}[1] واتە: وە پەروەردگارت بڕیاری داوە كە هیچ شتێ نەپەرستنبێجگەلەئەو، وە لەگەڵ دایك و باوكتان چاكە بكەن. بزانە كە ئەركی دایك وباوك زۆر قورسە بۆیە خوا دەفەرمووێت لەدوای پەرستنی من بەتاك و تەنهایی دواتر لەگەڵ دایك وباوك باش بن.بزانە ئەی ئەوانەی دایك و باوكتان هەیە ئەگەر شەو و ڕۆژ نوێژ بكەن بەڵام لەگەڵ دایك وباوك خراپبی، بەتایبەت دایك ئەگەر لێت ڕازی نەبێت ئەوا خواش لێت ڕازی نابێت،ڕازی بوونی دایك وباوك لەگەڵڕازی بوونی خوایە! وعنْ **عبدِ اللَّه بنِ عمرو رَضِي اللَّه عَنهما، عن النبي(ﷺ)قالَ: {رِضا اللَّهِ في رِضَا الوَالِدين، وَسخَطُ اللَّهِ فِي سَخَطِ الْوالِدين}**[2].واتە: لەعبدالله كوڕی ئیمامی عومەرەوە ئەویش لەپێغەمبەرەوە(ﷺ)دەفەرمووێت:

---

[1] الأسراء . {23}

[2] {اخرجه ترمذی}

ڕەزامەندی خودا لەهی دایك و باب دایە، وە تووڕەی و ڕقیشی لە تووڕەیی و ڕقی ئەواندایە. ئەی مندالی ژێر خوا نەكات لەگەڵیان خراپ بی چونكە هەر لەدنیا تیا ئەچی. گەر تۆش منداڵت ببێت ئەوا ئەویش بەهەمان شێوە لەگەڵت خراپ دەبێ. چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ)پێی ڕاگەیاندووین كە ئازاردانی دایك و باوك بەهیلاك بوونت دەبات. هەروەك دەفەرمووێت:**{اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ... وَعقُوق الوالدَين..}**[1].واتە: خۆتان بپارێزن لەو حەوت كردارەی كە مرۆڤ بە هیلاكدا دەبات، كە یەكێكیان خراپەكردنە لەگەڵ دایك و باوكوە ئازاردانی دایك و باوك یەكێكە لەتاوانە گەورە كان. هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرموویەتی **{ألا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟ قُلْنَا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ:{الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ}**[2]. واتە: ئایا گەورەترین تاوانەكانتان پێ ڕابگەیەنم سێ جار وتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمووی:هاوبەش دانان بۆ خوا، ڕەنجاندنی دایك و باوك. بۆیە دەبێت خۆمان بپارێزین لەئازاردانی دایك وباوك چونكە ئازاردانیان مرۆڤ بەهیلاك دەبات ژیانێكی تاڵ دەبێتە سەرنجامی هەر لەدنیاپاشان لەقیامەت ڕوو ڕەش ئەبێت، وە لەكاتی پیربوونیان پێویستە هەردەم نەرم و نیان بین لەگەڵیان نابێت قسەی ناشرینیان پێ بڵێن كە دڵیان ناخۆش بێت و قسەیەك بكەین خەفەتباریان

---

[1] {متفق علیة}
[2] {متفق علیة}

بکەین. هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرموویت: نابێت پێیان بڵێن ئۆف نەکو دڵیان لێمان برەنجێ! بەڵکو نەموونیانی بنوێنن بەرامبەریان {فَلَا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا}[1].واتە: هەر کاتێك یەکێکیان یان هەردووکیان بە پیری کەوتنە لای تۆ تەنانەت ئۆفیان لە دەست مەکەو هەرگیزپییایاندا هەڵمەشاخێ و هاواریان بەسەردا مەکە، بەردەوامیش قسەو گفتوگۆت لەگەڵیاندابا چاك و جوان و بەجێ بێت. دەبێت لەخزمەتیان بین لەهەمووکاتێکدالەوکاتەی کە نەخۆشئەکەون دەبێ بیان بەین بۆ لای دکتۆر هەوڵبدەین چارەسەریان بۆ بدۆزینەوە. یان بێ جل و بەرگ بوون بۆیان تەرخانبکەین،خواردنیان بۆئامادەبکەین خزمەتیان بکەین تاکو لە لامانن تائەو کاتەی ئەگەڕێنەوە لای خوای رب العالمین بەباشترین شێوە لەخزمەتیان بین و خزمەت بکرێن. چونکە ئەو دایك وباوکە ماوەیەکی زۆر خزمەتیان کردی لەخۆشی و ناخۆشی لەهەبوونی و نەبوونی، تامردن قەرزاری ئەوانین، بۆیە پێویستە لەسەر منداڵی ژیر لەهەموو کاتێکدا دووعای بەخێریان بۆبکەین تاکو خوا لێیان خۆشبێت.

[1] الأسراء . {23}

**{وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا حَتَّى إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ}**[1].واتە: ئێمە فەرمانمان بەئادەمیزاد داوەكە چاكەكارو چاكڕەفتار بێت، لەگەڵ دایک و باوكیدا، دایكی بەئازارەوە هەڵی گرتووەو بەدەم ئێش و ئازارەوەبوویەتی، سک پڕبوون و لەشیر بڕینەوەی سی دانە مانگی خایاندوون. هەتا كاتێک ئینسان دەگاتە حاڵەتی توندوتۆڵی و توانایی و تەمەنی چڵ ساڵی (ئەوسا ئیتر حەق وایە ئەم دووعایە بكاتەیەكێک لەوێردەكانی سەر زاری ) بڵێت: پەروەردگار، كۆمەكیم بكەو یارمەتیم بدەتا شوكرانەبژێر و سوپاسگوزاری ئەو نازو نیعمەتانە بم كەبەمن و دایک و باوكمت بەخشیوە، هەروەها یارمەتیم بدەلەو جۆرە كاروكردەوەچاكانەئەنجام بدەم،كەتۆ پێی ڕازیت، داواكاریشم چاكبڕوێنیت لەناو نەوەكانمدا لەبەر قازانجی خۆم چاكەی هەركەس بەشی دایک و باوكی تیادایە بەڕاستی من گەڕاومەتەوە بۆلای تۆ، تا لەگوناهەكانم خۆش ببێت و من لەموسڵمانانی گوێڕایەڵ و فەرمانبەردارم. بۆیە تاكو لەژیاندان و نەمردوون با لەئێستاوە خۆمانیان بۆئامادە بكەین بۆخزمەتكردنیان تا ببێتە هۆی چوونە بەهەشتمان. هەروەك عبدالله ی كوڕی عومەر ڕەحمەتی خوای

[1] الأحقاف . {15}

لێبیت ئامۆژگاری طیسەلەی کوڕی مەیاسی کرد بەوەی حەزدەکەی لـەئاگری دۆزەخ ڕزگـارت بێـت؟ طیســەل وتی:بەڵێ، پێـی وت دایـك وباوکـت زینـدوون،وتی: بـەڵێ پێی وت: **{فـوالله لـو النـت لهـا الکـلام، واطعمتهـا الطعام،لتـدخلن الجنـه، ماجتنبـت الکبـائر}**[1].واتـه: سـوێند بـەخوا گـەر بـە زمـانی شـیرین لـە گەڵیـدا بـدوێیت و خـواردنی بـۆ ئامادەبکەیت ئەوا دەچیتە بەهەشتەوە بەمەرجێ خۆت بپارێزیت لە گوناهە گەورەکان. ئەوجا ئەی منداڵی ژیر لەئیستاوە هەڵسوکەوتت بگۆڕە ببە بە منداڵێکی گوێڕایەڵی دایە و بابە تا خوا لێت ڕازی بێت بتاخەتە بەهەشتەوە.

**ئەی مندالی ژیر خوا نەکات لەگەڵیان خراپ بی چونکە هەر لەدنیا تیا ئەچی. گەر تۆش منداڵت ببێت ئەوا ئەویش بەهەمان شێوە لەگەڵت خراپ دەبێ.**

[1] {رواه البخاری فی الادب المفرد وصحیحه الابانی}

# چاو نەپاراستن

یـەکێك لـەو سـەرپێچییانەی کـە لـەم ڕۆژگارەی ئێـستا زۆر بـەر بڵاوە لـەنێو موسڵمانان بەتایبەتی لـەنێوچینی گەنجەکان بریتیە لە(نەزەر) واتــە: چــاو نەپاراســتن بەرامبــەر بەنامەحڕەمــەکان. بەڵــێ زۆربــەی موســڵمانان چاویــان ناپــارێزین لەســەیرکردنی نامــەحڕەم . خــوای پـەروەردگار ئەمرب پێغەمبـەر(ﷺ)دەکات کـە ڕایبگـەیەنێت کـەپیاوان چاویــان بپــارێزن لەســەیرکردنی ئافرەتــانی نامــەحڕەم. هــەروەك دەفــەرمووێت {قُــلْ لِلْمُــؤْمِنِينَ يَغُضُّــوا مِــنْ أَبْصَــارِهِمْ}[1].واتە:ئــەی پێغەمبەر(ﷺ)بە پیاوانی ئیماندار بڵێ چاویان بپارێزن لـە سـەرنجدانی ئافرەتـانی نامـەحڕەم، بـەڵێخوای گـەورە فـەرمانـدەکات بەپێغەمبـەری خـوا(ﷺ)کـە بـەپیاوان ڕابگـەیەنێ بـە گـەنج وپیر چاوەکانیـان بپـارێزن لەسـەیرکردنی ئافرەتانی نامەحرەم، چونکە ئەگەر بزانن ئەوە باشترە بۆئێوە {ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ}[2].واتە: بێگومان ئەوە پاکتر و چاکترە بۆیان. ئەی برایانی بەرێزم نەکەن لەفەرمانی خوا یاخی ببن بکەونە نێو تاوانەوە، ئەمانە سنوری خوای پەروەردگارن {تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا}[3].واتە: ئەمانە سنوورانی خودان و نزیکیان مەکەونەوە، بەڵێ برا ئازیزەکانم وامــەزانن خــوا ئاگادارنییــەکــاتێ بێفــەرمانی ئەکــەی، ئایــە بیــرت

---

[1] النور . {30}
[2] النور .{30}
[3] البقرة .{187}

نەكردۆتەوە خوایەك لەسەرووی ئاسمانەكان چاودێرە بەسەر دڵ وچاوەكان. {يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ}[1].واتە: ئەو خوایە هەمیشە چاوە خیانەتكارو ناپاكەكان دەناسێت و دەزانێت چی لە دڵ و دەروون و سینەكاندا حەشاردراوە. ئەوجا وامەزانە كە خوا ئاگادارنییە! بە ڕاستی چاو نەپاراستن لە سەیركردنی نامەحرەم دڵ وێران ئەكات،هەمیشە نەفس ئەكا بە دیڵی دەستی شەیتان بەئارەزووی خۆی دڵی كۆنترۆڵی ئەكات ،وە لەقیامەتیش ئەوكەسە سەر شۆرت ئەكات. بۆیە براكەم لەئێستاوە بیربكەوە هۆش و ئەقڵت بەكار بێنە كە نەزەركردن و چاونەپاراستن لە ڕووی نامەحرەم دەبێتە هۆی ئاشوبو فیتنە، بە هۆی نەزەركردن دووبەرەكی ڕوودەدات. بۆنمونە گەنجێك ڕۆژانە دەچێتە سەر ڕێگای كچانی نامەحرەم ئەم كوڕە گەنجە بۆتە پیشەی ڕۆژانەی، كاتێك دەڕواتە ماڵەوە شەو خەوی نییە چونكە كەوتۆتە نێوان گێژاوی فكرەوە، هەست و بیری لای پیشەی ڕۆژانەیەتی، فكری بۆ كاری خراپ دەچێ خوا پەنامان بدات، تاوای لێدێ دەڕواتە پیشەی ڕۆژانەی لەكاتێكدا لەسەر ڕێگایە لەو كاتی شەیتان دڵەكەی ئەم گەنجەی داگیر كردووە پڕی كرووە لەشەهەوات، كچە نامەحرەمەكە بەپێشیدا دەڕوات ئەوجا هەر خوادەزانێت چی ڕوودەدات! كاتێك شەیتان كارەكەی بۆ ڕازاندەوە دواتر تووشی كێشەی دەكات، كەتووشی كرد ئەوجا پشتی تێ ئەكات

[1] غافر . {19}

ئەڵێـت مـن لـەتۆ بـەریم! {قَـالَ إِنِّـي بَـرِيءٌ مِنْـكَ إِنِّـي أَخَـافُ اللَّـهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ}[1].واتـە: دەڵێ من لە تۆ بەریمە واتە دوورم لە تۆ من لە خـوای ئەم بـوونەوەرە دەترسـم. بەڵێ بیربکـەوە بـرا ئازیزەکـەم زۆر جـاری وا هەیە ئەم فیتنەیە پەرە دەسێنێ بۆیەکتر کوشتن! ئەم تاوانە هەمووی لەنـەزەرەوە سـەر هەڵـدەدات. هۆکارێکی تـر پەروەردەنـەکردنی منـداڵ لەلایـەن دایـك و باوکانـەوە سـەر هەڵـدە دات! زۆر پێویسـتە لەسـەر دایکو باوك چاودێری منداڵەکانیان بکەن هەوڵبدەن ترسی خوا لەدڵ و دەرونیـان فـەرهام بێـنن تـاکو زووە چونکـە دواتـر گـەر لەدەسـت دەرچـوون پێیـان ناکرێت کۆنترۆڵی منداڵەکـەیان بکەنـەوە بەئاسـانی ،دوارۆژێکی خراپ دەبێتە سەرنجامیان . بەڕاستی چاونەپاراستن هیچ سـوودی نییـە ئـەی براکـەم دەبیربکـەوە تـۆ کـاتێ نـەزەر ئەکـەی چ بەهایـەکی هەیـە کەسـەیری نامـەحرەم ئەکـەی تـەنها خـۆت زەرەر ئەکەیجگەلەوەیخۆتتووشینەخۆشـیدەروونیئەکەی! تـۆ هـەر سـەیری ئەوکەسـە نامەحرەمانـە بکـەهـەمووکات دڵنیابـە بۆتـۆ نـابن! گەرتۆوادەزانیبۆتۆدەبنکـە هـەموو کات بچیـە سـەر ڕێگایـان و چـاوت نـەپارێزی ئـەوە خـەیاڵێکی ئەوە خەیـاڵێکی خـاوە چـونکە هـی تۆدیـاریکراوە لەلایەن خـوای تعـالی لەوانەیە هەر ژن نەهێنـی و بەگەنجی بمری! هەمووشتێ بەویستی خوایە کەس نازانێ بەیانی چی

[1] الحشر . {16}

ڕوودەدات {وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا}[1] واتە: هیچ کەس نازانێت سبەی چی بەسەردێت وچی دەستدەکەوێت. گەر بەدوای زەواج و ژن هێنانی برۆ وەك پیاوان لە دەرگای ماڵەوەیان بدە ئەوەی تۆ دەتەوێ ، نەك بیکەی بە پیشەی ڕۆژانە بەردەوام بچیت بۆ سەر ڕێگا و خۆت تووشی تاوان و بێفەرمانی خوای گەورە بکەی ،ئەی ئەو کەسەی پیشەت سەیرکردنی نامەحرەمە ببە بە بەندەیەکی بۆخوا سولحاو ئەوە ژیانێکی خۆشت پێ دەبەخشێ خوای میهرەبان . بە ڕاستی موسڵمانی ڕاستەقینە و لەخواترس کەسانێکن کاتی لەشوێنێک چەند ئافرەتێکی نامەحرەم بە ڕێگا دەڕۆن یا لە هەرکات وساتێک بێ لەوکاتەدا لەدڵەوە بڕیار ئەدات لەگەڵ خوای پەروەردگار کە چاوی بپارێزێ و بەسەر نەفسی خۆی زاڵبێ و سەیریان نەکات. بەراستی ئەمەیە تەقواو لە خواترسانی موسڵمانی راستگۆ و شوێنکەوتەی پێغەمبەری نازدار(ﷺ) {أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا}[2] واتە: ئا ئەوانە هەر خۆیان ئیماندارانی ڕاستەقینەن بۆیە ئەی موسڵمان با ئێمەش هەوڵبدەین لەو جۆرەکەسانەبین کە بۆخوا ئەژین تا لە قیامەت سەرکەوتن بەدەستبێنن. ئەوەش بزانە گەر لەدنیا سنوری خوای پایەبەرزمان نەبەزاند هەمووشت بەدڵی ئێمە دەبێت .کەوایە ئەی برا بەڕێزەکەم بەگوێی هەواو ئارەزووت مەکە تا شوێنی یەکجارەکیت

---

[1] لقمان .{34}
[2] الأنفال .{4}

دۆزەخ نـەبێت خـوا پـەنامان بـدات، بەڵکو بـەگوێی فەرمانـەکانی خـوا بکـە تـا پێـت ببەخشـێ بەهەشــتە بـێ کوتایەکـەی، چونکـە ئەمـە باشترینە بۆ تۆگەر بزانیت.

**بـە ڕاســتی چــاو نەپاراســتن لــە ســەیرکردنی نامەحرەم دڵ وێران ئەکات،هەمیشە نەفس ئـەکا بە دیلّی دەستی شـەیتان بـەئارەزووی خـۆی دلّـی کـۆنترۆلی ئــەکات ،وە لەقیامــەتیش ئەوکەســە سەر شۆرت ئەکات.**

# زۆربوونی فیتنە

لەم سەردەمەی ئێستا فیتنە زۆر بووە بەتایبەت لەنێو موسڵمانان کە وای لێکردوون سارد ببنەوە لە دینەکەیان و واز بێنن لە فەرمانەکانی خوا. یەکێك لەو فیتنە ترسناکەی لەم ڕۆژگارەی ئێستا بەر بڵاوە فیتنەی ئافرەتە، خوای گەورە بەهۆی ئافرەتەوە پیاوەکان تاقی دەکاتەوە چونکە ئافرەت سەرنج ڕاکێشەرە وا لەپیاو دەکات بەرەو تاوانی گەورەی ببات. پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەفەرمووێ {**المَرأَةُعَورَة**}[1]. واتە: ئافرەت عەورەتە. لێرەدا مەبەستی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە کە ئافرەت سەرنج ڕاکێشە بۆ پیاو تەواوی بەدەنی ئافرەت بۆ بەرامبەر سەرنجڕاکێشەرە، بۆیە هۆکارێکە بۆهەڵخەڵتانی شەهەوەتی گەنجەکان. پێغەمبەرینازدار(ﷺ)وریای کردوینەتەوە لە فیتنەی ئافرەت هەروەك پێی ڕاگەیاندوین دەفەرمووێت: {**مَا تركْتُ بعْدِي فِتْنَةً هِي أَضَرُّ عَلَى الرِّجالِ منَ النِّسَاءِ** }[2]واتە: هیچ فیتنەیەکەم لەدوای خۆم جێ نەهێشتووە زەرەرمەند لەسەرپیاوان بەقەد ئافرەت بۆیە ئەی خوشکم وامەکە تۆ ئەو فیتنەیە بی کە پیاوان لەخشتە ببەی بەخۆ ڕازاندنەوە ولەبەرکردنی جلی تەسك و تەنك بەسە کەمێك ترسی خوات لەدڵ بێت ئەی خوشکی من! ئەگەر ماوەیەکە جلی شەرعی ناکەیە بەرت لە ئێستاوە بڕیار بدە بۆ دووایانجار جلێك بکەیە بەرت

[1] {رواه الترمذی}
[2] {متفق علیة}

خـوالێی ڕازی بێـت. بـەو خوشـكانەش ئـەڵێن كـە واز نـاهێنن لـەجلی ناشەرعی پێیان ئەڵێن بەسە تاكەی سەرپێچی و بێفەرمانی خوای تاك و تەنها. تاكەی پیاوان لەخشتە ئەبەن؟ تاكەی جلی شـەرعی ناكەنە بەرتان؟ تاكەی واز دێنن لـەجلی ڕووت و قـوت؟ دووبـارە بەخوشـكان ئەڵێنــەوە وەكــو موســڵمانێكی خەمخۆر،بــەدەنگێكی لەســەرخۆ و بەدڵێكی پڕ كەسەروخەم ئەو خەمەی ئێمە بۆ ئەوان تەنها ئەوەیە قیامـەت نـەدۆڕێنن بەدنیایـەكی كـاتی بۆیـە بـەبن گوێیانـەوە ئەڵـێم خوشـكی مـن بـۆچی خـۆت ئەڕازێنییـەوە بـۆ خەڵكی؟ ئایـە چ سـوودی هەیە لاشـەی خـۆت پێشـانی گورگـە برسییەكان بـدەی؟ ئایا دەتـەوێ بەڕێزبیت یا جوانتر بیت یا پلەو پایەت بەرز بێتەوە لەنێو خەڵكی كە لاشــەت دەرئەخــەی؟! نــەخێر ئــەوە بزانــە زۆر بــێ ڕێــز ئــەبیت بگــرە سـوكیش ئـەبی لـەبەر چاوی خەڵكەوە. زۆر بەداخـەوە بۆ هەندێك لـە خوشـكان بـەخۆیان دەیانـەوێت بێ ڕێز بـن لـەنێو گومـەڵگا، دەیانـەوێ گەنجەكان تەعلیقیان لێبدەن فشـەیان پێ بكرێت، لەخوا بترسە ئەی خوشـكی مـن ڕێزی مرۆڤایـەتی خـۆت بگـرە **{وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آَدَمَ}**[1].واتـە: سـوێند بەخوا بێگومان ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرت. بەڵام ئێمە بە وویسـتی خۆمـان بێڕێـزی بـەخۆمان ئەكـەین خۆمـان بـۆ گەنجـەكان ئەڕازێنیــەوە ،كــەچی خــوای گــەورە هەرلەســەرەتای دورســتبوونی مرۆڤــەوە ڕێــزی لێگرتــوون بەســـەر دروســـتكراوەكانی تـــر.

---

[1] الأسراء . {70}

**{وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا}**[1] واتە: بەڕاستی ئێمە ڕێزی زیادەی ئەوانمان داوە بەسەر زۆربەی ئەو بەدیهێنراوانەدا کە دروستمان کردوون (لە هەموو ڕوویەکەوە، تا قەدرو ڕێزی خۆیان بزانن). بەڵام خوشکانمان زۆربەیان لەوە بێ ئاگان هەر بە جوانی خۆیان ئەنازن، قەدرو ڕێزی خۆیان لەبیر کردووە! چاکەو بەخشش و فەزڵی خوای گەورە لەبیر ئەکەن گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ناکەن.**{فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُبِينٌ}**[2].واتە: کەچی خێرابووەتە دوژمنێکی ئاشکراو دژایەتیمان دەکات. بۆیە خوشکی من بیر بکەوە بۆچی ئەتەوێ ببی بە ڤایرۆس بەناوگەنجەکان بڵاوببیەوە؟! بۆچی ئەبیتە هۆی کردنەوەی دەرگای خراپە؟! ئەی خوشکە ژیرەکەم گەر تۆ خۆت نەڕازاندەوە نەبووتە هۆی کردنەوەی دەرگای خراپە بۆیان فەرمانی خوای گەورەت جێبەجێکرد ئەوکات کەس بە چاوی خراپ سەیرت ناکات .
پێغەمبەری خودا (ﷺ)فەرموویەتی**{إِنَّ مِنْ النَّاسِ مَفَاتِيحَ لِلْخَيْرِ مَغَالِيقَ لِلشَّرِّ وَإِنَّ مِنْ النَّاسِ مَفَاتِيحَ لِلشَّرِّ مَغَالِيقَ لِلْخَيْرِ فَطُوبَى لِمَنْ جَعَلَ اللَّهُ مَفَاتِيحَ الْخَيْرِ عَلَى يَدَيْهِ وَوَيْلٌ لِمَنْ جَعَلَ اللهُ مَفَاتِيحَ الشَّرِّ عَلَى يَدَيْهِ }**[3].واتە: خەڵکانێ هەن کلیلی کردنەوەی چاکەن و داخستنی خراپەن، وە هەروەها خەڵکانێ هەن کلیلی کردنەوەی خراپەن، وە داخەری کلیلی چاکەن، سەرفرازی بۆ ئەو کەسەی کە خودای گەورە ئەیکاتە

---

[1] الأسراء . {70}
[2] يس . {77}
[3] {رواه ابن ماجة}

هۆكاری كلیلی كـردنەوەی چاكە، وە وەیل بـۆ ئەو كەسـەی كەئەبێتە هۆكاری كـردنەوەی كلیلی شـەڕوخراپە. بـەڵێ ئەی خوشـكی مـن تـۆش ببـە بەیـەكێك لـەو كەسـانەی كـە ئەبنـە هـۆی كردنـەوە دەرگای خێرو چاكـە گـەر ژیـرو ئاقـڵ بیـت. دەبیـر بكـەوە خوشـكە سـەنگینەكەم بۆبەدەستی خۆت سەرەنجامی خۆت وێران ئەكەی؟ ئایا دەتەوێ لـە دوارۆژدا شـوێنت ناو ئاگری دۆزەخ بێ؟! تۆ لە دنیا بەرگەی سـووتانی سـەر پەنجـەت نـاگری! ئـەی چـۆن بەرگـەی ئـاگری ئـەو ڕۆژە دەگریـت كەلاشەكەت سوتێندرا دووبارە لاشەت بۆ نوێ ئەكرێتەوە وەك جاری یەكـەم لـەپاش سـووتانی! بۆئـەوەی زیـاتر عـەزابی خـوا بچێـژن **{سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ}**[1]. واتـە: لـە ئاینـدەدا دەیانسـوتێنین بـەئاگری دۆزەخ، هـەموو جارێـک پێسـتیان داوەشـاو سـووتاو هـەڵقرچا، پێسـتی تـر دەكـەین بەبەریانـدا، بـۆ ئەوەی بـە چـاكی سزاو ئازار بچێژن. سـبحان الله خـوا بمـان پارێزێـت لــە عــەزابی دوا ڕۆژ. ئــەی ئــەو خوشــكانەی جلـی شـەرموحەیا ناكەنـە بەرتان دەبیـر بكـەوە كەسەرەنجامیئەوكەسـانەی خراپەكارن لەدنیای كاتی بێ فـەرمانی خـوا بۆتـە پیشـەیان لـەدوا ڕۆژدا ئائـەوە پاداشـتیانە كـە عـەزابی سـەختە. بەڵام لەبیـرت نـەچێ ئـەی خوشـكی مـن گـەر لەدنیافەرمانـەكانیخواتجێ بـەجێ كـرد، پۆشـاكی شــەرعیت كردتــە بــەرت نوێژەكانــت بــەجێ گەیانــد بــۆ خــوا ژیایــت

[1] النساء.{56}

لـەدنیای کـاتی ئـەوا پاداشــتەکەت لـەلای خـوای گـەورە بەهەشــتی فیــردەوسە، **{إِنَّ الَّــذِينَ آمَنُــوا وَعَمِلُــوا الصَّــالِحَاتِ كَانَــتْ لَهُــمْ جَنَّــاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا}**[1] یواتـە: بەڕاستی ئەوانـەی کـە ئیمان و باوەڕیـان هێناوەو کـردەوە چاکـەکانیان ئەنجامـداوە، ئێمـە هـەر لـە زووەوە بەهەشــتی فیردەوسـمانبۆ ئامـادە کـردوون، تـا لـەوێ دابـەزن و ژیـانی کامـەرانی تیایدا بەرنەسەر. بۆیە با خۆمانی بۆ ئامادە بکەین تا لەدنیاین ئەی خوشکی بەڕێزم تا ئێمەش یەکێك بین لەو کەسانە کە لەدوا ڕۆژدا ژیـــــــانێکی بەختـــــــەوەریان بـــــــۆ هەیـــــــە.

**ئەی خوشکە ژیرەکەم گەر تۆ خۆت نەڕازاندەوە نەبووتە هۆی کردنەوەی دەرگای خراپە بۆیان فەرمانی خوای گەورەت جێبەجێکرد ئەوکات کەس بە چاوی خراپ سەیرت ناکات .**

[1] الكهف . {107}

## پەیامێك بۆخوشكی بێئاگا

بـالێرەوە کـەمێك بچینـە خزمـەت ئـەو خوشـکانەی بێئاگـان بـەدوای خۆشـی دنیـا کەوتوونــە ئاواتیــان تــەنها خۆشــییە بــەڵام هــیچ خۆشـییەکیان نـەبینیوە، چونکـە ئـەو خۆشـییەی ئـەوان بـەدوای کەوتوونە هەواو ئارەزووی خۆیانە کە پێشبڕکێ ئەکەن لەسەر ئەوەی کێ زیاتر جلی سەرنج ڕاکیش و تەسك و نمیچە ڕووت لەبەر بکات بۆ غـەیری هاوســەرەکانیان خۆیـان بـۆ گورگـەکان برِازێننـەوە ئەمـەش کەوای کردووە سەرپێچی فەرمانی خوا بکەن **{وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ}**[1] . واتـە: شـوێن هـەوا و ئارەزووت مەکەوە با لـەڕێگای خــوا لات نــەدات. هــەر بــەدوای هــەواو وئــارەزووی خۆیــان دەکــەون کــەوای لێکــردوون لــەڕێگای خــوا لابــدەن و بکەونــە نێــو تاوانــەوە. خوشــکی ســەنگینم هیــوادارم گــەر بتــوانی بــەگوێ دڵ گوێبیســتی ووتــەکانم بیــت هەســت و بیــری خــۆت بدەیتــە ئــەم ئامۆژگاریــە سـەرفرازی دنیـاو قیامـەتی پێوە بەنـدە .ئایا خوشکی بەرێزم تـا ئێسـتا بیـرت کردۆتـەوە بـۆ هاتوویتـە دنیـایی کـاتی؟ ئایـا پرسـیارت کـردووە لەناخی خۆت بەبیرو هەست لەکوێ هاتووی؟ بۆچی هاتووی بۆ کوێ دەڕۆی؟ بۆچی دەمریت؟خوشکم ئایا تائێستا ئەم پرسیارانەت لە خۆ کـردووە. بیربکەوە خوشکی سـەنگینم، دوور لەخۆشی ونـازو نیعمـەتی

[1] ص . {26}

ئـەم ئیسـلامە پاكـە ژیـان مانایـەكی بـەهاداری نـابێ بـەڵام بەداخـەوە هەنـدێك لـەم ڕاسـتیە نـازانن. چونكـە خۆشـی ژیانی دنیا تـەنها لـەناو بازنەی ئیسلامە ، نەك لە ناو تاوان و سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە نەمانی شەڕەف و ناموس ڕۆژانە گەنجەكان لەسەر ڕێگا و شوێنەكان تـەعلیق و قسـەی نەشـیاومان پێبڵـێن . بـەڵام گـەر هاتیـە نـاو بازنـەی ئیسـلام جلـی شــەرعیت كــردە بــەر كـاروكردەوەی چاكــەمان كــرد و لەفـەرمانی خـوا دەرنـەچووین، بێگومـان خـوای میهرەبـان بـە ژیـانێكی خـۆش دەمـان ژینێ،هـەروەكو خـوای پـەروەردگار دەفەرمووێـت: **{مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً}**[1]. واتە: هەر كەس لـەنێر یان مێ كاروكردەوەی چاكە بكات وبڕوادار بێت ئەوا بە ژیانێكی خۆش دەیانژێنین. هەندێك لـە خوشكان كاتێك ئامۆژگاریـیان ئــەكرێت گوێیــان كــەڕ ئەكــەن، دڵــەكانیا دائەخــەن بەرامبەربــە ئایەتەكانی خوا، هەر ئەو كاتەیە كەقسەیان بۆئەكەی دواتر دەڕۆنەوە سەر پیشەی خۆیان خۆ ڕازاندنەوەییە بۆگورگەكان پاشان پشتكردنە لەبەرنامەكـەی خوا،جلێك لەبـەر دەكـەن بـۆدەوام و بـازارە و شـوێنە گشـتییەكان هـەروەك ئـەوە وایـە كەلەبـەریان نییـە وە بـەنازو لـەنج لــەڕێ دەڕۆن لــە نێــو خــەڵك ! پێغەمبــەری ئــازیز(ﷺ) وەســفی ئــەو زەمانـەی ئێسـتای بۆ كردووین دەربارە ئەو ئافرەتانـەی بۆتـە پیشـەیان ئەمكردەوە ناپەسـەندانە.

---

[1] النحل . {97}

عن أبی هريرة (رضی الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ){ صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّـارِ لَـمْ أَرَهُمَـا :وَنِسَـاءٌ كَاسِـيَاتٌ عَارِيَـاتٌ، مُمِـيلاَتٌ مَـائِلاَتٌ، رُءُوسُـهُنَّ كَأَسْنِمَةِالْبُخْتِ الْمَائِلَةِ،لاَيَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلاَيَجِدْنَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا}[1].واتە: لە ئەبوهورەیرەوە خوالێی رازی بێت بۆمان ئەگێرێتەوە ئەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ)فەرموویەتی: دووکۆمەڵ هەن لـە ئـەهلی ئاگرکەنەمدیوون: کۆمەڵی دووەم ژنـانێکی پۆشـتەن بەڵام ڕووتن،کەبەلەنجـەولار ئـەڕۆن. سەرسـەریان وەك پشـتی حوشـتری لێدەکـەن (واتـە: گـەورەی دەکـەن بـەهۆی کۆکردنـەوەی قژیـان لەسەرسـەریان و دەیبەسـتن) ناچنەبەهەشتەوەوبۆنیشـی ناکـەن، لەکاتێکدا کە بۆنی بەهەشت لە دووری ئەوەندە و ئەوەندەوە هەستی پێ دەکرێ. بۆیە ئەی خوشکی ژێر تۆزێك لەخوا بترسە واز لە تاوان و سـەرپێچی بێنـە خـوا پێی ڕاگەیانـدووین کـە بـەدوای هـەنگاوەکانی شـەیتان نەکـەوین.{وَلَا تَتَّبِعُـوا خُطُـوَاتِ الشَّـيْطَانِ}[2].واتـە: دوای هـەنگاوەکانی شـەیتان مەکـەون. چونکـە شـەیتانی نەفـەرەت لێ کـراو هـەردەم لەسـەنگەرە دژبە بەندەکانی خوا تـا بـەرەو دۆزەخ ڕەوانـەیان بکـات. بۆیـە خـوا دەفەرمـووێ: {إِنَّـهُ لَكُـمْ عَـدُوٌّ مُبِينٌ}[3].واتـە: بەڕاسـتی شـەیتان دووژمنێکی ئاشکراتانە.ئەی خوشکی موسڵمان لـەو ساتەوە بگـەڕێوە بـۆژێر فەرمانـەکانی خـوا بـەدڵ سـۆزی جێ بـەجێ یـان بکـە.

---

[1] {صحيح مسلم}
[2] البقرة . {168}
[3] البقرة . {168}

قوتـابی لەقوتابخـانە مامۆسـتاکەی واجبی پێئەدات ئەبێ واجـبەکە جێبەجێ بکـات بـۆئەوەی لەدوایـی سـەرکەوتن بەدەسـت بینێ، گەر هـاتوو واجـبەکەی جێبەجێ نەکـرد ئەوا دوایـی خـۆی زەرەر ئەکا ئەی دۆڕێنێ و دەرنـاچێ! بـۆیە ئەی خوشـکی ژیـر گەر تـۆش دەتەوێ سـەر کەوتـووبی و بەهەشـت بەدەسـت بێنی ئەوافەرمـانی خـوا جێبەجێ بکە،بەڵێ ئـەی خوشـکی سـەنگینم زۆر ئاگـاداری هـاوڕێ و دەورووبەرەکـــەت بـــە بەخۆدەرخســـتنیان هەڵمەخەڵـــەتێ کـــە ئـــەوان سەرپۆشیان فڕێ داوەپێت بڵێن دەی دەی چ نیە کەمێ خۆت جوان بکـە جـارێ گـەنجین ! دواتـر پەشـیمان دەبیـەوە لای خـوای گـەورە {**وَقَـالُوا رَبَّنَـا إِنَّـا أَطَعْنَـا سَـادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَـا فَأَضَلُّونَا السَّـبِيلَا**}[1].واتـە: دەڵـێن ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە بەگوێی سەران و گەورەکانمان کرد ئیتر لـە ڕێگـای ڕاسـت گومڕایـان کـردین. بزانـە خوشـکە بەڕیـزەکەم، هـــاوڕێ خراپـــەکان دوارۆژێکـــی ڕەش چاوەڕێیانـــە چونکـــە بـــەدوای فێڵەکانی شەیتان کەوتوون نازانن کە شەیتان دژی وان دەجەنگێ بۆ ئـــەوەی گومڕایـــان بکـــات. لـــەو کاتـــەی شـــەیتان نەفـــرینی لـێ کراولەبەهەشـت دەرکـرا سـوێندی خـوارد بـە خـوای تـاك و تـەنها کـە عەبدەکانی خـوا گومڕا بکـات تـەنها ئەوانە نەبێت کە بۆ خـوا دەژین و دڵسـۆزن لەجێبـەجێکردنی فەرمانـەکانی خـوا. هـەروەك خـوا لەسـەر

[1] الأحزاب . {67}

زمـانی شـەیتان دەفەرمووێـت: {قَـالَ فَبِعِزَّتِـكَ لَأُغْـوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِـينَ}[1] واتـە: شـەیتان وتی سـوێند بـەعیزەتت هـەر هـەموویان گومڕا دەكـەم. ئایـە تاكـەی بڕیـار نـادەی تـۆش ئـەی خوشـكە دژی شـەیتان خۆتپۆشـتە بكـــەی تابچیـــە ڕیـــزی بەنـــدە دڵســـۆزەكان {إِلَّا عِبَـــادَكَ مِـــنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ}[2] واتـە: تـەنها ئەوانـە نـەبێت كەبەنـدەی پـاك و هـەڵبژاردەی تـۆن. خوشـكم هەوڵبـدە بەسـەربەرزی بـژی لـەو ژیانـە كورتـەی كـە هەتـە،دوور لـەچاوی گورگـە برسـیەكان. بۆئـەوەی بەسـەر بـەرزی بگـــەڕێوە لای خـــالقی خـــۆت. چونكـــە لـــەو رۆژە پەشـــیمان دەبیتەوەخوشكی من بیر بكەوە لەداهاتووت داخۆ سەرەنجامت چیەو بۆكـوێ دەڕۆی! بێگومـان هـەر دە بێـت بگەڕێیـەوە بـۆلای خـوای رب العلمـین. بۆنمونـە تـۆ ئێسـتا كچێكـی هـەژدە سـاڵی دوایـی ئـەبیت بەگـەنجێكی لێهـاتوو دوای ئـەوە دێنـە داوات دواتـر ئـەبی بـە دایكـی منداڵان، خوشكی من لـەپاش ئەوە چی دێت؟ بێگومان پیر بوون. بابە زۆری بیسـت و پێـنج سـاڵ بـژی دوای پیـر بـوون، دواتـر سـەرنجامت گەڕانەوەیـە بـۆ لای خـوا! بـەڵام چ گەڕانەوەیـەك پـڕ خـەمو پـەژارە و پەشیمانی، بەڵام خوشكم ئایا پەشیمانی دادت دەدات؟ لەكاتێكدا تۆ لـە دنیـای كـاتی غـەرقی تـاوان و بێ ئـەمری كردنـی خـوا بوویـت جلـی حەیاو شەرمت فڕێ دابوو؟!

---

[1] ص .{82}
[2] ص . {83}

**{حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ}**[1].واتە: هەتا کاتێ مردن دێت بۆهەرکامیان ئەوسا دەڵێ ئەی پەروەردگارم بمگێڕەوە بۆ دنیا. ئایە ئەو داوایەت جێبەجێدەکرێت تابگەڕێەوە بۆدنیا ؟! **{لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِنْ وَرَائِهِمْ بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ}**[2].واتە: بەڵکو کردەوەی چاك بکەم لەبری ئەوەی نەمکردووە لەو تەمەنەی لەدەستم چوو خوا پێ دەفەرمووێت نەخێر بێگومان ئەمەی دەیڵێ تەنها قسەیەکە ئەوە دەیڵێ ئەگەر بگەڕێیەوە بۆدنیا هەروەك جاران دەبیت. بۆیە خوشکی بێئاگام لەئێستاوە قۆڵت هەڵبکە لەکاری چاکە و بڕیار بدە لەوساتەوە بۆخوا ژیان بۆخوا مردن بکەئامانجت، تائەو تەمەنە کورتەی کەماوتە جلیشەرم وحەیا بپۆشەدژ بەوانەی دەیان ئەوێ ڕووت و قوت بی چونکە ئەمەیە ئەتگەیەنێتە شوێنی مەبەستی هەتا هەتایی کە بەهەشتی نەبڕاوەیە

**خوشکم هەوڵبدە بەسەربەرزی بژی لەو ژیانە کورتەی کە هەتە دوور لەچاوی گورگە برسیەکان. بۆئەوەی بەسەر بەرزی بگەڕێوە لای خالقی خۆت.**

[1] الؤمنون .{99}
[2] الؤمنون .{100}

# نەرمو و نیانی

یەکێك لەو ڕەوشتە فەرامۆشکراوەی که لەم ڕۆژگارەی ئێستا دا زۆر کەم بڵاوە لەهەڵسوکەوت و ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤی موسڵمان دا بریتییە لە نەرموونیانی. ئەگەر بێت و مرۆڤی موسڵمان ئەم ڕەوشتە بەرزەیتیابوو ئەوا لەنێو خەڵکی خۆشەویست ئەبێت و بەچاوی ڕێزەوە سەیر ئەکرێت. وە خوای پەروەردگار کەسی نەرموونیانی خۆشدەوێت هەروەك پێغەمبەری (ﷺ)دەفەرموێ: {**إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ**}[1].واتە:خوای گەورە نەرموونیانە و نەرموونیانی خۆشدەوێت.زۆر پێویستە کەوا ئینسان هەوڵبدات ئەم ڕەوشتە بەرزە لەخۆی بێنێتە دێ بەرمبەر بەخەڵکی و بەتایبەت دایك و باوك، چونکە زۆرکەس هەیە بێ ڕێزە بەرامبەر بەدایك و باوکی بەڵام کەسانی نەرموونیان زۆر عاقڵ و تێگەیشتوون زۆر لەسەرخۆن. وە ئەگەر هاتووکەسانی خراپ قسەی نابەجێیان پێ بڵێن ئەوا بەقسەیەك وڵامیان ئەدەنەوە کە پێیان گوناه نەبێت. {**وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا**}[2].واتە: بەندە تایبەتییەکانی خوای میهرەبان کەسانێکن بە ویقارو نەرمی دەڕۆن بەسەر زەوی دا (بێ لووت بەرزی و کەشخە و فیزکردن) وە کاتێ نەزان و نەفامەکان (بە وتەی ناشرین) لەگەڵیان بدوێن وتەیەك دەڵێن پێیان گوناه نەبێت.

[1] {راوه مسلم}
[2] الفرقان .{63}

بەڕاستی ئەمانەن موسڵمانی تێ گەیشتوون کەنەرموونیانن بەرامبەر هـاوڕێ ، دراوسێ ، میـوان ..هتـد. نەرموونیانیڕێگایەکـەبـۆ بانگـەوازی کردنـی کەسـانی خـراپ بۆسـەر ڕێگـای ڕاسـتی ئیسـلام! دەبێـت هەوڵبـدەین و خۆمـان رابهێنـین لەسـەر ئـەم ئەخلاقـە بـەرزە لەگـەل دەوروبـەرمان . خـوای پـەروەدگار فـەرمانمان پێ ئـەکات لـەو کەسـانە بین کـە نـەرمونیانن {ثُمَّ كَانَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ}[1] واتـە: سـەرەڕای ئەوانـەش ئادەمیـزاد دەبێـت لەوانـەبێت کـەباوەڕیـان هێنـاوە و ئامۆژگاری یـەکتریان کـردووە لەسـەر خـۆگری و ئـارامگری و هـەروەها ئامۆژگـاری یـەکتریان کـردووە لەسـەر خـۆی و نەرمونیانی کەسی موسڵمان وا لەکەسی خراپئەکاتکەواچاویلێ بکات چونکە گەر ئەو خراپەی لەگەڵ بکات ئەوا بەچاکە وڵامی ئەداتەوە! لەسـەر ڕەحـم و بـەزەیی و میهرەبـانی. بۆیـە برایـان و خوشـکانم گـەر دەتەوێت کەوا لـەڕۆژی دوایی لەوکەسانە بی کـە خـوا لێیـان ڕازییـە و بـە شـادی وبەختـەوەری ئـەژین ئـەوا خـۆت بڕازێنـەوە بـەو سـیفەتە جوانە.{أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ}[2].واتـە: (ئەوانـەی بـەو سـیفەتە جوانانـە خۆیـان دەڕازێننـەوە) ئەوانـە دەسـتەی ڕاسـت و دەسـتەی بەختەوەرانن.کەوایەبەنـدەکانی خـوا بـا لەدنیابەنـەرمونیانی بـژین تـا لەقیامەتیش خوای گەورە بەباشترین شێوە پاداشتمان بداتەوە.

---

[1] البلد .{17}

[2] البلد.{18}

# هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیان

ژیان بەسەربردن لە دنیادا پێویستی بە کەسێکە هاوبەشت بێت لە هەمووکات و سات و بوارێکی ژیانی ڕۆژانەدا، بۆیە مرۆڤ بۆ ئەوە دروست بووە تاکو لە دنیا ژیان ببەنە سەر جا بۆیە خوای گەورە ئافرەتی کردووە هاوبەشی ژیان بۆ پیاو. { وَمِنْ آَيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا }[1] . واتە: لەنیشانەو بەلگەکانی خوای پەروەردگار ئەوەیە کە بۆی دروست کردوون لە ڕەگەزی خۆتان هاوسەرانێك . بێگومان پیاو پێویستی بە هاوسەرە بۆئەوەی ژیان بەڕێبکات لە دنیا. پاشان خوای گەورە خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی خستۆتە نێوانیان تاهەست بەخۆشی بکەن لەژیان { لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً }[2] واتە: بۆئەوەی ئارم بگرن لەلایان دا وە خۆشەویستی و بەزەیی خستۆتە نێوانتان . هاوبەشی ژیان واتە بەیەکەوەبوون تا سەر ئەنجام کەمردنە! بۆیە لە گەڵت ژیان دەباتە سەر مەگەر کێشە و ڕووداو بێتەگۆڕ کە ببێتە هۆی لێکجیابوونەوە ئەمە پەیوەستە بەو کاتەی ژیان دەبە نەسەر، ئەگەر یە کیتری لەیەکدابڕان وجیابوونەوەی نێوانیان بە هۆی مردنە ئەمەش بێ گومان ڕوودانی مسۆگەرە! سەرەتا پێش هەموو شتێك دەبێ بگەڕێنەوە بۆلای قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تابزانین

[1] الروم .{21}
[2] الروم .{21}

چـــــۆن هاوبەشـــــی ژیـــــان هـــــەڵبژێـــــرن بیکـــــەن بـــەهاوســـەریخۆمان.خوایگەورەدەفەرمووێ: {وَالطَّيِّبَــاتُ لِلطَّيِّبِــينَ وَالطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَاتِ}[1] واتـە: ئافرەتـانی پـاكیش بـۆ پیاوانی پـاك، پیـاوانی پـاكیش بـۆ ئافرەتـانی پـاك. بەڵێ ژیـانی هاوسـەرێتی سـەركەوتو وتـەنها ئەوەیـە كـە هـەردوولا دینـدار و دڵێكی پـڕ لەئیمانبن،ئەوكات ژیـانێكی بەختـەوەریـیان بـۆ مسـۆگەردەبێت. پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نەسـیحەت و ئامۆژگاری كـردووین بۆ هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیان كە تەنها دینەكەی گرنگـــە لـــەپێش هـــەموو شـــتێكەوە نـــەك قـــەومو عەشـــیرەت و دەولەمەندی یان جوانی چونكە ئەمانە هیچ نابنە هۆی بەختـەوەری جگـە دیـن و ئـەخڵاق هـەروەك پێغەمبـەری ئـازیز(ﷺ) دەفـەرمووێت . عَـن أَبي هُريـرة رضي اللَّـهُ تَعَـالَى عَنـه عَـنِ النـبي(ﷺ)قـال: {تُنْكحُ الْمَرْأَةُ لأرْبَـعٍ: لمالهـا ولِحَسَـبِها ولِجَمَالهـا وَلـدِينها: فَـاظْفَرْ بـذاتِ الـدِّينِ}[2]. واتـە: لـە ئـــــەبـــــو هـــــورەیرەوە ڕەزای خـــــوای لەســـــەربێت پێغەمـــبەر(ﷺ)دەفەرمووێت:ئـــافرەت بـــۆ چوارشـــت خـــوازبێنی وهاوسـەرگیری لەگەڵ ئەكریـت، یـان بـۆ سـامان و پـارە و پـولەكەی، یـان بـۆ نەسـەب، یـان بـۆ جـوانییەكەی، یـان بـۆدینەكەی، ئێـوەش خاونـدینەكە بـۆ خۆتـان بەرن. سـەیر بكـەن بـرا و خوشـكانی بـەرێزم دینەكـەی لـە سـەرووی هـەموو شـتێكەوە دانـاوە چونكـە هـەموو

[1] النور .{26}
[2] {متفق علية}

شتشەرتی دین و ئەخلاقە! سەرەتا دەبێ ئەوە بزانی ئەو کەسەی دەتەوێ بیکەی بە هاوبەشی ژیانت کەسێکی وا بێ کە پەشیمان نەبیەوە لە پاشەڕۆژ، زۆربەی برایان و خوشکانی سەنگینم لەم بوارە شکستدێنن بە هۆی ئەوەی پیاوەکەی یان ژنەکەی باشنەبووە لەگەڵی یان زۆربەی کاتەکانیان بەشەڕو ئاژاوە بەسەربردووە. بۆخوشکەکانم زۆر پێویستە پێش ئەوەی دەست بەژیانێکی نوێ بکەی ئەو کەسەی دەتەوێ بیکەی بە هاوبەشی ژیان بزانی کەوا کەسێکی چۆنە لە خواترسی دڵ پڕ لە ئیمانە چونکە ئەوە باشترین سەروەتە بۆتۆ گەربزانی ئەو کەسەی لە خواترسە ناتوانێ لەگەڵت خراپ بێ چونکە دەزانێ مردنێ هەیە کە کەسقورتاری نابێ لێی،بۆیەهەوڵدەدات دائیم لەگەڵت باشبێ و وەسیەتەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)جێبەجێ بکات کە فەرمان دەکات لەگەڵ خێزانەکانتان چاکبن.{وَاسْتَوْصُوابِالنِّسَاءِخَيْرًا}[1].واتە: وەسیەتان بۆدەکەم لەگەڵ ئافرەتان باشبن. بۆیەئەوگەنجەهەوڵدەدات ژیانێکی بەختەوەر لەگەڵت بەسەربەبات،ژیانێکی پڕ لە یادگاری و خۆشەویستی و تەبایی وە جەوانێکی پڕ لە ئیمانی شەوانیش بە شەونوێژ، بەڕاستی ئا ئەمەیە بەرهەمی گەنجی بە تەقواو لە خواترس کە دەبێتە هاوسەرت، بۆیە بە هیچ شێوەیەک دوودڵ مە بە خوشکی بەرێزم لەو گەنجانەی دێنە داوات کە خاوەن ئاکار و ڕەوشتی

[1]{صحیح البخاری}

ئیسلامین. بەڵام ئەو کەسانەی لەڕووی ئ یمانەوە لاوازن ژیانێکی وا خۆشت پێ نا بەخشێ تا می لێ بکەی چونکە ئەو کەسەی هاتە داوات تۆ لەبەر جوانیەکەی یا لەبەر ناوبانگی یا دەوڵەمەندی یا...هتد، ڕازیبووی پێی بەڵام کەسانێکی خوا ویست هەبوون پێیان ڕازینەئەبووی بە هۆی ئەوەی هەژارن یابێ ناوبانگن یان لە قەومی ترن یان شتیتر. ئەوجائەوکەسەی لە ڕووی دینەوە لاوازە زۆربەیان لە ژیانی هاوسەریەتی نازانن چونکە ترسی خوایان لە دڵ نییە هاوڕێ خراپیان هەیە نیوەشەواندێنەوە لەبازاڕ و شوێنەگشتییەکان بە هۆی کات بەسەربردنیان بەشتی بێ سوود قومار و شەترەنج...هتد، هیچ خەمیان لە خێزانەکان یان نییە شەواندێنەوە هیلاک و ماندو بێ ئەوەی نوێژی کردبێ یەکسەردەخەوێ. ژیانێکی پڕ لە دەردەسەری و ناخۆشیان بۆ دەبێ بەهۆی ئەوەی پیاوەکە پشتی لە دینی خواکردبووە{وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا}[1].واتە: ئەوەی ڕوو وەربگێڕێت لە بەرنامە و یادیمن پشتی تێ بکات، بێگومان بۆ ئەو جۆرەکەسانە ژیانێکی تاڵ و ناخۆش پێشدێت. بۆیەزۆرپێویستەلەسەرخوشکان کەسانێک هەڵبژێرن کە خەڵکی شانازیتان پێوە بکەن بەوەی خێزانێکی بێ کێشەن وتەبان بائەو گەنجە هەژاربێ و بێ ناوبانگ و بێ پلەو پۆست بێت بەڵکو گرنگ دین و ڕەوشتەکەیە ، بەهەمان شێوە بۆ گەنجەکە با کچێك هەڵبژێت

[1] طه .{124}

ئەخلاق و ڕەوشتی وەك( فاطیمە و ئەسماء و مریم و ئاسیایی خێزانی فیرعـەون بێـت) کـەچۆن ئـافرەت بـوون لەپێشـەنگی ڕێبـوارانی ڕێگای خواویستی. نەك بەدوای ئافرەتانی دنیا ویست بیت ئامانج یان مالی دنیایی و داواکردنی زێری زۆر و خانووی بەرز و ناوبانگ بێت بۆیە براو خوشکانی بـەڕێز پاشـەڕۆژی خـۆت والێ مەکە بىێ بە دۆزەخ چـونکە ژیـانی هاوسـەرییەتی بـۆ چەنـد ڕۆژێـک نیـیە بەڵکـو تـا مـردنە. بـۆیە پاشەڕۆژت لەگەڵ کەسانێکی تەقوادارو خاوەن ڕەوشت ببەسەر کە دەوڵەمەنـدبێ لە ڕووی ئیمـانەوە کە هـێلانەیەک دروسـتبکەن بـۆنی تەقوا و ئیمانی لێ بێ دنیا تان بۆ ببێ بە بەهەشتی سەرزەوی. ئەوەش بـزانە ژیـانی ژن و مێردایەتی هەتاسـەرنابێ بەڵکو ژیـانێکی کاتیە بـا بە زۆری بیسـت سـاڵ بەیەکەوەبـن دوایـی پـیر ئەبـن، مـردن کەم کەم نزیـک ئەبێـتەوە لێتـان، منـداڵەکانتان بە خێوتـان ئەکەن و ئەوانـیش ئەبن بە خاوەن منداڵ. بۆیە لەم دنیایە با بۆخوا بژین تا لەقیامەت بەختەوەربـین، کەسـانێک هەڵبژێـرین خـاوەن ئیمـانێکی پـتەوبن بـۆ ئەوەی کەمێک لە زەت و خۆشی لەژیانی کەمی دنیاببنن.

## ئەوخوشکانەی دەڵێن بەختمان نیە

زۆرێك لەخوشكان شووكردنیان تاخیر دەبێ بەهۆی هەرهۆكارێك بێت لەژیانی دنیا خوشكانی سەنگینم سەرەتا دەبێ ئەوە بزانین كە خوای گـەورە ئێمـەی دروسـتكردووە لـەم دنیایـە تـا تاقیمـان بكاتـەوە بـۆ دنیاكەی تر كە قیامەتە {**الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا**}[1]. واتـە: هـەر ئـەو خـۆی مـردن و ژیـانی بـە دیهێنـاوە، تـا تاقیتـان بكاتـەوە، كێتـان كـردەوەی چـاكترە، ئەو جا گـەر لـەم ژیانـەی دنیا لـە تاقیكردنـەوەكـە سـەركەوتوو بـووی شـوكرانەو سوپاسـی خـوات كـرد لەسـەر ناخۆشی وخۆشی یەكان ئەوا خوای گەورە داخلی بەهەشتت دەكات. بەڵام گـەر لـەم تاقیكردنەوەیە دەرنـەچووی گوێڕایـەڵی خـوای پایـە بـەرزت نـەكرد سوپاسـی خـوات نـەدەكرد ئـەوا سـەرئەنجامێكی ڕیسواكەر پاداشتە . خوای گەورە مرۆڤەكان بەزۆرشت تاقی دەكاتەوە لـە دنیـا هەیـە {چـاوی نییـە ،گـوێی نییـە، شـەلەلە پێـی نییـە، جسـمی ناتـەواوە، یـان خـوای پـەروەردگار تاقیـت دەكاتـەوە بـەوەی هـەرژن نـەهێنێت یـان شـوونەكەی یـان منـداڵت نـەبێت ئێمـە هـی خـوای گەورەین چۆن بیەوێ ئەوها ژیانمان بەڕێوە دەبات ئێمە نازانین خێر لـە چیدایـە، لەوانەیـە حـەزمـان لەزۆرشـت بـێ لـەم ژیانـەی دنیـا (وەك،ژنـی جوان،یـا پیـاوی بـە ناوبانـگ ، یـا لـە هـەمووخەڵك

---
[1] الملك .{2}

جــوانترین یــا بــەناوبانگترین یــا دەوڵەمەنــدی یــا پلەوپایــە و بڕوانامە...هتـد، لەوانەیەبەدەسـتی نـەهێنین **{وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُـوا شَـيْئًا وَهُـوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّـوا شَـيْئًا وَهُـوَ شَـرٌّ لَكُمْ}**[1] . واتـە:لەوانەیـە شتێکتان لا ناخۆشبێت کەچی خێر لـەوە دابێت، هـەروەها لەوانەیە شتێکتان پێ خۆشبێت کەچی شەڕ لـەوە دابێت. بێگومان هـەر خـوا خـۆی دەزانێـت (خێـرلەچیدایە)، ئێـوە نـایزانن. بـەڵێ کەسـی وا هەیـە زوو قسـمەتی دەبێ شـوودەکات خـوای گـەورە تـاقی دەکاتـەوە بـەوەی هەرمندالی نـەبێت یان ژیانێکی ناخۆش یان دەبێ لـەگەڵ مێردەکەی بەردەوام شەڕیان دەبێت یان تا 10 ساڵ بەیەکەوەدەبن دوایی تەڵاقی بدات ئێمەی مرۆڤ نازانین ژیانی داهاتوومان چۆن دەبێ خۆش یان نـاخۆش، نـەبوونی یـان هـەبوونی **{وَمَـا تَـدْرِي نَفْسٌ مَـاذَا تَكْسِـبُ غَـدًا}**[2]. واتە: هیچ کەس نازانێت سبەی چی بەسەردێت وچی دەستدەکەوێت. بەڵێ زۆر پێویستە لـە سـەرمان لـە خۆشی و نـا خۆشی سوپاسی خـوا بکەین تا لـەکاتی تەنگانەو خەفەت بە هانامانەوەبێ. هیچ کات خـەم مــەخۆ ئــەی خوشــکی مــن بــەوەی کەوابەختتنییەلــەژیان چونکەخوایــــــــەکمان هەیەئاگادارەبەخەموخەفــــــــەت ،خۆشیوناخۆشیدڵمان**{وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنْفُسِكُمْ}**[3].واتە:بزانن بێگومان خوادەزانێت بەوەی کە لـە دڵتاندایە. بۆیـە قـەت بێ هیـوا

---

[1] البقرة .{216}
[2] لقمان .{34}
[3] البقرة .{235}

مەبە لە ڕەحم و سۆزی خوای پەروەردگار، لەوانەیە تۆ تا ماوەیەك شوونەكەی خوا تاقیت دەكاتەوە تاوەك بڵێ ئەم بە ندە یە م تاچە ند سوپاس و شوكرانەم دەكات خۆڕاگرە لەسەر ناخۆشییەكان، یان بەوەی هەر شوونەكەی لەوانەیە تۆقسمەتت نەبێ خوای گەورە تاقیت دەكاتەوە گەر سوپاس و شوكری خوات كرد خۆڕاگربووی خوای گەورە بەباشترین شێوە پاداشتت دەداتەوە لە قیامەت. دڵنیابە هەر ناخۆشییەك كەبەسەر موسڵمان دێ لەژیانی دنیا لەخەم و ناخۆشی و ئازار بەسەبرگرتن لەسەری هۆكارێكە بۆسڕینەوەی تاوانەكان. **{ مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلَ اوَصَبٍ وَلَا هَمٍّ وَلَا حُزْنٍ وَلَاأَذًى وَلَا غَمٍّ حَتَّى الشَّوْكَة يُشَاكُهَا إِلَّا كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ }**[1]. واتە:پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەفەرمووێت: هەرشتێك تووشی موسڵمان ببێت لەخەم و خەفەت و ئازار و ناخۆشی و دڵتەنگی و ناڕەحەتی ئیلا خودا لە تاوانەكانی دەسڕێتەوە بەسەبرگرتن لە سەری ئەگەر دڕكێكیش بێت تاوانت كەم دەكاتەوە بەسەبرگرتن. بۆیە سەبرگرتن لە دواكەوتنی زەواج و تاخیربوون و خۆڕاگری لە نزیكبوونەوەی تاوان باشترین پاداشتی هەیە لەلای خودای گەورە. بۆیە هەمووكات خوات لەبیربێ دڵنیابە خوا باشتری دەوێ لە خۆت بۆخۆت چونكە خوای گەورە زۆر بە ڕەحم و میهرەبانە بۆ ئەوانەی كە باوەڕداری ڕاستەقینەن

---

[1] {متفق علية}

{وَكَـانَ بِـالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًـا}[1]. واتــە: (جائەوپــەروەردگارە) هەمیشــە و بــەردەوام بــۆ ئیمانــداران بــە ڕەحــم و میهرەبــان و دلۆڤانــە. گــەر بەندەیەکی ڕاستگۆبی دڵسۆزبی لـە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوا دڵنیابە خـوا ئاواتـەکانت دێنێتـە دی گـەر ڕۆژێ ك لەتەمەنت مابێ. کەوایـە بۆخـوای گـەورە بـژی لـەژیانی دنیاشـوکر بـە لەسـەر ئـەو تاقیکردنەوانەی دنیا لەوەی بەسەرت دێ لەخۆشی و ناخۆشییەکانی تــــا ســــــەرکەوتووی هـــــــەردوودنیا بــــــین .

گــەر بەندەیــەکی ڕاســتگۆ و دڵســۆزبی لەجێبـەجێکردنی فەرمانـەکانی خـوا دڵنیابـە خــوا ئاواتــەکانت دێنێتــە دێ گــەر ڕۆژێــك لەتەمەنت مابێ.

[1] الأحزاب .{43}

# ڕووخێنەری خۆشییەکان

بـا بچینـه خزمـەت ئـەو ڕووداوه مسـۆگەرە کـەدەبێ هـەر ڕووبـدات لـەژیانی هـەموو تـاکێکی زینـدووی سـەر ئـەم زەمینـه، بێگومـان ئـەم ڕووداوە کاتی نەزانراوه, وەختی هاتنی بۆهەرکەسێك کاتی سفرە! ئەم ڕووداوه ڕوخێنـەرە دڵ هەژێنه ناونراوه به **مردن**! بەڵێ براو خوشکی بەڕێزم مردن کارەساتێکه ڕوودانی لەناکاوە، بێگومان دەبێت هەموو نەفسێك ئـەوەی گیـان لەبـەرە تـامی مـردن دەبێ بنۆشێ. {**كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَـةُ الْمَـوْتِ**}[1].واتە:هـەموو نەفسێ ئـەبێ چێـژی مـردن بکـات. ئـەوجا ئەوگیانلەبەرە ڕەشـە سپیە یاخود هـەژارە دەوڵەمەندە یاخـود گەنجە پیرە! بێ جیاوازی هیچ پلەو پایە وشتێك،مردن دەتبات لەگەڵ خۆی و دەتگوازێتەوە لە دنیای کاتی بۆدنیای ئەبەدی، مردن گواستنەوەیە، بۆنمونـە: لەشـارێك دەڕۆی بۆشـارێکی تـر بـەچی دەڕۆی بـە ئۆتۆمبێـل، تـۆش لـە دنیـای کـاتی ئێسـتا، ماوەیـەکی تـر مـردن ئۆتۆمبێلەکەیـە دەتگوازێتـەوە بۆدنیای نـەمری! بزانـە هـەموو کەسێك مەترسی مردنی لەسـەرە لەهـەموو کات و شـوێنکدا! کێ ناڵێـت تـۆ بـەهۆی ڕووداوێك یـان بـەر بوونەوەیـەك یـان نەخۆشـیەکی کتـوپڕ، یـان بـەهۆی هـەر شتێکی تر کە خوا ویستی لەسەر بێت دەمریت و دەگەڕێیەوە بۆ ماڵی یەکجاری! وە هیچ کەس ونەفس و گیان لەبەرێك بەبێ ئیزنی خوای

[1]العنكبوت .{57}

کارلەجێ نامرێت . { **وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَابًا مُؤَجَّلًا** }[1].
واتە: هیچ کەسێك نەبووە کە بمرێت مەگەر بە فەرمانی خوا لە کات و دیاری کراوی خۆی نەبێت . وەهیچ کەس نازانی لەچ شوێن و مەکانێك گیان ئەسپێری و ئەگەڕێتەوە بۆ مالی هەمیشەیی . {**وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ**}[2].واتە: هیچ کەس نازانێ لە چ شوێن و زەوییەك دا دەمرێ. ئەی بەندەی خوا بیر بکەوە کە ڕۆژێکت لەپێشە دەبێ هەر پێی بگەی ئەگەر یەك دەقەی تر، یان یەك مانگی تر، یان یەك سالی تر بێت، دەبێت ئەو ڕۆژە هەربێت بۆهەموو نەفسێك ئەوەی زیندووە بێگومان! دەبێ لەناو بچێ بێجگە لەخوای تاك وتەنها {**كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ**}[3].واتە: هەرچی کەس لەسەر زەوی دایە نامێنێ و تیا دەچێ. ئەی ئەو کەسانەی دنیاتان داگیر کردووە خۆتان بەسەر خەلْکی گەورە ئەکەن بە دەولەمەندی و قەوم و پلەو پایە بۆچی دلْتان خۆش ئەکەن بۆچی زیاتر بۆدنیا هەولْئەدەن نازانن خوایەك هەیە ئێوە و هەموو دنیای لەژێر دەستە ڕۆژێك دێ لەم دنیایە ئەتانگوازێتەوە بۆدنیاکەی تر کە قیامەتە!{**وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ**}[4].واتە: وە هەر پەروەردگارت دەمێنێ کە خاوەن شکۆی ڕێزدارە. بۆیە زۆر پێویستە خۆمان بۆئەو ڕۆژە ئامادە بکەین، خۆمان کۆبکەیەنەوە

---

[1]ال عمران .{145}
[2]لقمان .{34}
[3]الرحمن .{26}
[4]الرحمن .{27}

جانتاكانمـان پـڕی چاكـە بكـەین و بخـەینـە شـانمان كـە كاتێك مـردن لـەدەرگامان دەدات یەكسـەر بەگـەڵی بكـەوین! بـۆ ئـەوەی پەشـیمان ببینـەوە وخۆمـان ئامادە نـەكردبێت. **{عـن البـراء - رضي الله عنـه - قـال كنا مع رسول (ﷺ)في جَنازة فَجَلس عَلى شَفيرالقبر فبكى حَتى بلَّ الثرى ثم قالَ" يَا إِخْوَانِي، لِمِثْلِ هَذَا فَأَعِدُّوا}**[1] واتە:لە براء خـوالێی ڕازی بێت ووتی: لـەگەڵ پێغـەمبـەر بووین(ﷺ) لـە بە خـاك سپاردنێك دانیشت لەسـەر لێواری قـە بـر گریا تـاكو زە وی تـەڕ كـرد ئینجـا فـەرمووی: برایانم بـۆ ڕۆژێكی وەك و ئـەمڕۆ خۆتـان ئامادە بكـەن. زۆر پێویسـتە خـۆ ئامادە كـردن بـۆ مـردن واتـە بـەرێ كردنـی توێشـوو بـۆ دوای مـردن، وە زۆر یادكردنی و بیر لێكردنەوەی نیشانەی لـەخوا ترسانە كە وات لێبكات دووربكەوییەوە لـەتاوان . **{قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أىَ النـاس أكيس؟ قلـت: الله و رَسـوله أعلَـم، قــالَ(ﷺ)إِنَّ أَكْـيَسَ النَّـاسِ أَكْثـَرُهُمْ لِلْمَـوْتِ ذِكْرًا،وَأَحْسَنُهُمْ لِلْمَـوْتِ اسْـتِعْدَاداً}**[2]. واتە:پێغـەمبـەر (ﷺ)پرسـیاری كـرد ژیرترین كـەس كێیـە؟ وتیان: خـوا و پێغـەمبـەر باشتر دەزانن. پێغـەمبـەر (ﷺ)فـەرمووی: ژیرترین كـەس ئەوكـەسـەیە كە زۆر بیری مردن ئـەكات، وە باشـترین خـەڵكی ئـەو كەسـەیە هەمیشـە ئامادەیـە بـۆمردن واتـە خـۆی سـازكردووە خـەمی نییـە كـاروكردەوەی چاكـەی زۆرە ئامادەیـە بـۆمردن. تـاوەكو ئەجـەلمان نـەهاتووە بـا لـەئیسـتاوە خۆمـان ئامادە

---

[1] {رواه ابن ماجة}
[2] {متفق علية}

بکەین بۆمردن، کاروکردەوەی چاکە بکەین هەوڵبدەین کارێك بکەین خـوا لـەخۆمان ڕازی بکـەین چونکـە تـاکو لـەدنیان فرسـەتە بۆمـان! چونکە گـەرکاتی ئەجـەلمان هـات فریشتەی مـەرگ ڕووخسـەت نـادات پێی بڵێن بـا یـەك جـار بڵێن سـبحان الله الحمدلله!یەکسـەر ڕاپێچمـان دەکـات بۆمـاڵی هـەتا هـەتایی! **{فَـإِذَا جَـاءَ أَجَلُهُـمْ لَا يَسْـتَأْخِرُونَ سَـاعَةً وَلَا يَسْـتَقْدِمُونَ}**[1].واتـە: جـا گـەر ئـەو کاتـەی خـۆی هـات، ئیتـر بـە هـیچ شـێوەیەك پێشخسـتن و دواخسـتنی تیـا نییـە. حـاڵی ئەوکەسـانەی کـە تـەنها لـەژیانی دنیـا ڕابـواردن و خۆشـی و گاڵتـەکردن بـە ئیسـلام و موسڵمانان بوو! کەسەر تاپای ژیانیان بێ فەرمانیکردنی خوای تاك و تەنها بـوو دنیـا غـافڵی کردبـوون وایـان دەزانـی کـەوا نـامرن ئـەوجا لـەو کاتـەی فریشـتەی گیـان کێشـان بـۆ هەریـەك دێـت. **{كَـلَّا إِذَا بَلَغَـتِ التَّرَاقِيَ}**[2].واتە: نەخێر ئەو خەڵکە هەروا ژیانیان بەردەوام نابێت بەڵکو کاتێـك دێـت کـە ڕۆحـی یـەك بەیـەکیان دەگاتـە گـەرووی. بەڵـێ براوخوشکانم خۆهەروا بەخۆشی لەم دنیایە نامێنینەوە ژیان ببەینە سـەر دنیـا داگیـر بکـەین.**{وَقِيـلَ مَـنْ رَاقٍ}**[3].واتـە: ئەوسـا دەگوترێت:ئایـا پزیشکێك، نوشتەیەك دووعایەك دەستناکەوێت تا چاکی بکاتەوە وا تـەرمی بێ گیـان لـەوێ کـەوتووە دەبـا کەسـێك هـەبێ چـارەی بکـات

---

[1]الأعراف .{34}
[2]القيامة .{26}
[3]اليقامة .{27}

وبیگەڕێنێتەوە بۆ ژیان! {وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ}[1]. واتە: بەڵام لەو کاتەدا، ئەو کەسـەی لەسـەرە مەرگدایـە دڵنیایـە کـە ئیتـر هـیچ شـتێك فریـای ناکەوێت و کاتی ماڵئاواییە. بێگومان بێ دەسەڵاتە لەوکاتی دەزانی گەر دنیـا هــەموو لــە پشــتیبن ســوودی نیــە تــازە ! {وَالْتَفَّــتِ السَّــاقُ بِالسَّاقِ}[2].واتـە: ئیتر قـاچ و لـوولاق بەیەکدا دەئاڵێن بەهۆی سەختی ئــەو ڕۆژە نەخێــر بەداخــەوە لــەو ســاتەی مــەرگ دەبێتــە میــوانی هەرکەسێك ئـەوا هـیچ واستەیەك نـاخوات تـا ڕزگاری بێـت! وەهـیچ دەرمانێکت دە ستناکەوێت تا عیلاجت بکات وبتگەڕێنێتەوە دنیا! لەو ڕۆژەدا هـەڵاتن و ڕاکردن نییـە تـا نـەجاتت بێ لـەمردن! {قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّـذِي تَفِـرُّونَ مِنْـهُ فَإِنَّـهُ مُلَاقِـيكُمْ ثُـمَّ تُـرَدُّونَ إِلَى عَـالِمِ الْغَيْـبِ وَالشَّـهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ}[3].واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)بڵێ بەڕاستی ئەو مردنەی کە لێی ڕادەکەن بێگومان پێتان دەگات و تووشتان دەبێ لەپاشـان دەگەڕێنرێنـەوە بـۆ لای خـوای زانـا بەئاشـکراو نهێنی ئینجـا هــەواڵتان پـێ دەدات بــەوەی کــە دەتــان کــرد. گــەر ئێســتا تــۆ وازت لـەنوێژەکانت هێناوە یان جلی شـەرعی ناکەیتـەبەرت و گوێڕایـەڵی خـوا ناکــەیت! ئــەوە لەئێســتاوە بڕیــار بــدە جێبــەجێیان بکــە ببــە بەموســڵمانێکی بۆخــوا ســولحاو، چونکــە لــەو کاتــەی ملــك مــوت لـەدەرگات دەدات نـاتوانی خـۆت قوتاربکـەی ئەگـەر بەهێزترین کەسی

[1] القیامة .{28}
[2] القیامة .{29}
[3] الجمعة.{8}

دنیـاش بیـت! {أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِكُّكُمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنْتُمْ فِي بُرُوجٍ مُشَيَّدَةٍ}[1].
واتـە: دڵنیابن لـە هـەرکوێ بن مردن یەخـەتان پێ دەگرێت، با لـەناو چەندەها قـەڵاو شـوێنی سـەخت و قـایمیش دابن ئەی بەندەکانی خوا بـا لەوسـاتەوە مـەردی خـوا بـین بـا هـەردەم بیـر لـەمردن بکەینـەوە بۆسـاتێکش لەبیـری نەکـەین! باوامـان لێ نێـت ژیـانی کـورتی دنیـا لەخشـتەمان ببـات، وا نەکـەین کـەوا سـنووری خـوا ببـەزێنین! بـا هـەردەم مـەردی خـوا بین وا نەکـەین بـۆ سـاتێکیش دوور لەبەرنامـەی خـوا بـژین چونکـە گـەر وابکـەین دواڕۆژی خۆمـان وێـران ئەکـەین شـوێنمان دۆزەخ ئـەبێ خـوا بمـان پـارێزێ بـەڵام گـەر بـۆ خـوا ژیـان لەفەرمانـەکانی دەرنـەچووین ئـەوا خـوای گـەورە بەڵێنـی پـێ داویـن بەبەهەشتی نەبڕاوەکـەی. {وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ}[2]. واتـە: خـوای گـەورە بەڵێنـی داوە بـە ئیمانـداران لـە پیـاوان و لـە ئافرەتـان، بەوەی کەباخـەکانی بەهەشتیان پێ دەبەخشێت بۆیە براو خوشکانم بـا لەئێسـتاوە بڕیـار بـدەین لەگـەڵ خـوا کـە بەندەیـەکی ڕاسـت گـۆ و دڵپـاك بـین فەرمانـەکانی جێبەجێبکـەین تـا لـەڕۆژی دوایـی لـەژێر ڕەحمەتی خوا ژیانێکی بێ خەم ودوورلەناخۆشی ببەیە سەر.

---

[1] النساء .{78}
[2] التوبة.{72}

# پەروەردەكردنی منالْ

دایـك وبـاوك ئـەركێكی زۆر قورسـیان لەسـەر شـانە لەبەرامبـەر پـەروەردەكردنی منداڵـەكانیان. زۆر پێویسـتە لەسـەر دایـك وبـاوك تـاوەكو زووە وكۆنترۆڵیـان لەدەسـتە منداڵـەكانیان فێـرە ڕەوشـت و پەروەردەیەكی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) بكەن. دایك و باوكی بەڕێزم گەر دەتانـەوێ لـەدوارۆژدا بەدەسـت منداڵـەكانتان فـڕێ نەدرێنـە سـەر شـەقام كـۆڵان و بـن دیوارەكـان، وە ئەگـەر بتانـەوێ منداڵـەكانتان لـەكاتی گـەنجی سـەری خۆتـان پێیانـەوە سپی نەكـەن و خـەم نـەخۆن بەهۆی گوێ نەداری منداڵەكانتان، تاكومنداڵن گەورە نەبوون وەرن فێری ئەخلاق و ڕەوشتی بەرزی پێغەمەری نازداری (ﷺ)بكەن، چونكە بەڕاستی پێغەمبەر(ﷺ)ڕەحمەتە بۆسەرجەم كێشەو گرفتەكان. {**وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ**}[1]. واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) تۆمان تەنها بۆ ئـەوە نـاردووە كـە ڕەحمـەت بیت بـۆ جیهـان یـان. بەڕاسـتی دەرمـانی هەموو نەخۆشی یەكانە ئەم نازدارە بەتایبەت بۆ دایك و باوكان گەر ئاكارو ئـەخلاق و ڕاسـپاردەكانی بـەكاری بێـنن بـۆ گرفتـەكانیان ئـەوا كێشـەكانیان نـامێنی لەگـەڵ منداڵـەكانیان، وە بیكـەن بەچارەسـەری سـەرەكی، پاشـان لەخۆشـیاندا ڕەنـگ بداتـەوە، نـابێ بـەس بـۆ منداڵەكانیان بەكاری بێنن دەبێ ئەوانیش ببن

[1] الأنبياء .{107}

بەدایك و باوكێكی نمونەیی وقوتابی زانكۆی ئیسلام و پەروەردەی قورئان و سوونەتیان تەواو كردبێ. دەبێ ڕاسپاردەی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) جێبەجێ بكەن كە ئەمر بە باوك و دایكان دەكات كە لەتەمەنی حەوت ساڵی منداڵەكانیان فێری نوێژ بكەن وە لە دە ساڵی لەسەر نوێژ نەكردن لێیان بدەن. لەفەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە كە فەرموویەتی: { مُرُوا أَوْلادَكُمْ بِالصَّلاةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ }[1].واتە:فەرمان بە منالەكانتان بكەن كە نوێژبكەن لە تەمەنی حەوت ساڵی دا وە لە تەمەنی دە ساڵی ئەگەر نەیان كرد لێیان بدە ن، وە هەر لەوتەمەنەش دا جێگاكانیان جیا بكەنەوە لە یەكتری، واتە جێگای خوشك و براكان. زۆر گرنگە دایك و باوكان كاتێك تەمەنی منداڵەكەیان دەبێتە حەوت ساڵی ڕای بهێنن لەسەر نوێژكردن لەگەڵ خۆیان نوێژی پێ بكەن بەقسەی خۆش و دیاری پێشكەشی بكەن تا بەگوێیان بكەن دەبێتدایك و باوك چاودێریكی پوختی منداڵەكانیان بكەن بەپێی ئەخلاق و ڕەوشتی موسڵمانان وسوونەتی پێغەمبەر (ﷺ)چونكە ئەوەی گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ)بكات ئەوا بەڕاستی سەرفرازبووە لەدنیاو قیامەت و سەركەوتو دەبێت.

[1]{ رواه أبو داوود،والترمذی }

**{وَمَـا آَتَـاكُمُ الرَّسُـولُ فَخُـذُوهُ وَمَـا نَهَـاكُمْ عَنْـهُ فَـانْتَهُوا}**[1]. واتـه: ئـەوەی پێغەمبەر(ﷺ)پێیدان وەری بگرن وە ئەوەی لێتانی قەدەغە كرد وازی لێ بێنن. نابێـت دایـك وباوكـان منداڵـەكانیان پشـتگوێ بخـەن لـە فێركردنیـان بەپەروەردەیـەكی ئیسـلامی و بڵـێن جـارێ منداڵـە هێشـتا زۆری مـاوە خـۆ دنیـا دوورو درێـژە وە منداڵـەكانیان ئیهمـال بكـەن بەڕاستی ئەمە كارەسـات بـەدوای خـۆی دێنـی. وە لـەلایەكی تـر ئەوەیە بـەجێ نەگەیانـدنی فـەرمانـەكانی خـوا پاشـان پێغەمبـەر(ﷺ)**{وَمَـا كَانَ لِمُـؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَـةٍ إِذَا قَضَـى اللَّـهُ وَرَسُـولُهُ أَمْـرًا أَنْ يَكُـونَ لَهُـمُ الْخِيَرَةُ مِـنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْـصِ اللَّـهَ وَرَسُـولَهُ فَقَـدْ ضَـلَّ ضَـلَالًا مُبِينًـا}**[2].واتـه: بـۆ هـیچ پیـاوو ئـافرەتێكی بـاوەڕدار نییـه كـاتێ خـواو پێغەمبەرەكـەی (ﷺ)بڕیـاری هەر كارێكیان دا (بۆیان نییه) كه سەرپشك بن له كارەكەیاندا وە هەر كەس سەرپێچی خواو پێغەمبەرەكەی بكات ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بــه گومڕابــوونێكی ئاشــكرا. دەبێــت فەرمانــەكانی خـــوا پاشـــان پێغەمبەر(ﷺ)بخەینە سەر سەرمان لەخۆشی و ناخۆشی جێبەجێیان بكـەین ئـەوكاتی ئیمانمـان تـەواو و كامـڵ دەبێـت. هەوڵبـدەین هـەر لەمنداڵیه لەتەمەنی سێ ساڵی و چوارساڵی وە فێری ناوەكانی خوایان بكەین یان ووشەی (لا إله إلا الله) لەدوامان بڵینەوە بەقسەی خۆش بەدیاری پێشكەش كردن وەبڵێن پێیان ڕۆڵه ئەم شرینیەت پێئەدەم

[1] الحشر.{7}
[2] الأحزاب.{36}

لەدووام بڵێیەوە تا زمانیان لەسەر ڕادێ ، بۆئەوەی گەورە بوون ببن بەنمونـــە بـــۆ دایـــە و بابـــە. وە بەڕاســـتی ئـــەم دنیایـــە هـــەمووی تاقیکردنەوەیـە بۆموسـڵمان خـوای پـەروەردگار بەزۆرشـت تاقیمـان دەکاتــەوە. یــەکێك لــەوان مــاڵ و منداڵــە کەمرۆڤــەکان پــێ تــاقی دەکرێتەوە، کوا داخۆ چەند ئەو دایك و باوکە سوپاسی خوا دەکەن لەسەری، لەوانەیەهەیە منداڵیان پێ نەدات، یان پێیان بدات ناتەواو بێت یان منداڵیان هەبێ بۆماوەیەك دواتر لێیان بمرێ. **{وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْـوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُـمْ فِتْنَـةٌ وَأَنَّ اللَّـهَ عِنْـدَهُ أَجْـرٌ عَظِـيمٌ}**[1]. واتــە: وە بــزانن بەڕاستی ماڵ و منداڵتان هۆی تاقیکردنەوەی ئێوەن وە بەڕاستی لای خـوا پاداشـتی زۆر گەورە هەیە. بۆیە ئەی دایك و باوکان هەوڵبـدەن ماندوبوونتان بخەنە گەڕ بە پەروەردەیەکی ئیسلامی بۆمنداڵەکانتان و خۆتان باش ئامادە بکەن تا لەو تاقیکردنەوەیە سەرکەوتن بەدەست بێنن، تا خەڵاتە گرانبەهاکە بەدەست بێنن کەبەهەشتە ڕازاوەکەیە.

[1] الأنفال .{28}

# تەوبەو گەڕانەوە

مرۆڤـەكان بەگشـتی لەهـەموو ڕوویكـەوە تووشـی تـاوان و سـەرپێچی كـردن دەبـن، ئـەم تـاوان و سـەرپێچیە هۆكـاری سـەرەكی شـەیتانە كـەتاوان لای مرۆڤـەكان ئـەڕازێنێتـەوە تابەڵێنەكـەی بباتـە سـەر كـە بەخـوای تـاك وتـەنهای دابـوو هـەر ئەوكاتـەی كـە ئادەمی دروسـتكرد، وتی: سـوێند بەگـەورەیت دەبێ هـەموویان لەخشـتەببەم لەڕێگاییـەك خواپەرسـتی لایانـدەم بـەرە و جەهالـەت و نـەزانین تـا بـەرەو دۆزەخ بیاننێرێت. هـەروەك خـوا لەسـەر زمانی شـەیتان دەفەرمووێـت: {قَـالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ}[1]. واتـە: شـەیتان وتی سـوێند بە عیـزەتت هـەر هـەموویان گـومڕا دەكـەم. بـەڵام ئایـا هـەموو خـەڵكی گومڕادەكـات نەخێر مەگەر كەسانێكی بۆ خـوا سولحاوی دڵسۆز لە جێبەجێكردنی بەرنامـەی خـوا كـە ئیسـلامە. {إِلَّا عِبَـادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ}[2]. واتـە: تـەنها ئەوانە نەبێت كەبەندەی پاك و هەڵبژاردەی تۆن ، بەڵێ ئەی برایان و خوشكانم با ئێمـەش لـەو كەسـانە بین بۆخـوا سـولحاون كەشـەیتان توانای نییە زەفەریان پێ ببات بەهۆی توندی و دامەزراوی ئیمانیان، قـەڵای پارێزگاریـان بریتییەلـە (تەوحیـد) یـەك خـوا پەرسـتی كـەس توانای نیە بەرەو لەناو چوونیان ببات. بەڵام كەسانێك كە ئەم قەڵا پتەوەیان نییە زوو تووشی لەناوچوون ئەبن، ئەكەونە دوای شـەیتان

---

[1] ص .{82}
[2] ص.{83}

و لەنێو تاوانەکانیان مەلە ئەکەن، ئەمەش ڕێگایەکی ڕوونەبۆ چوونە دۆزەخ خوا پەنامان بدات، تاوان و سەرپێچی ئەو کەسانەی لەیادو زیکری خوا دوورخستۆتەوە، وای لێکردوون بەس بۆ دنیا بژین بێئاگا بن لەئاخیرەت و گەڕانەوە بۆ لای خوا. ئەم جۆرە کەسانە بیریان نەکردۆتەوە لەگەڵ ئەقڵی خۆیان وتووێژبکەن. ئایەئەم دنیایە بە فشەو هەوانتە دروستکراوە؟ ئایا زەوی و ئاسمان و چیاکان هەر لەخۆیەوە دروستبوونە؟ ئایا دڵۆپەی ئاوی باران هەر لەخۆیەوە دەبارێتە سەر زەوی؟ ئایا کۆرپە لەنێو سکی دایك کێ ڕزقی دەدات کێ گەورەی دەکات؟ بەڵێ هەر ئەو خوایەکە یەکەمجار دروستی کردین هەرخۆی شایەنی ئەوەیە کە بیپەرستین و تەنها سەرمان بۆ ئەو نزم بکەین. {أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا}[1]. واتە: ئاخۆ زەویمان بۆ ڕانەخستوون؟ ئایە تاکەی واز ناهێنین لەبێ فەرمانی خوای گەورە لەکاتێك زەوی بۆکردووین بەفەرش تا بەخۆشی ژیان ببەینە سەر. ئایا ئاوی بارانی بۆنەباراندووین کە بۆتە هۆی ڕەحمەت و میهرەبانی بۆسەرجەم مەخلوقات. {وَأَنْزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا}[2]. واتە: ئایە لە هەورە گوشراوەکان بارانێکی زۆرمان نەباراندووە؟ بەڵێ ئەی براوخوشکانی بەڕێزم تاکەی بیردەکەیەوە لە داهاتووت کە تۆ ئێستا خوات لەخۆت ڕەنجاندووە، بەهۆی سەرپێچی کردنت بەرامبەر

[1] النبأ.{6}
[2] النبأ.{14}

بەفەرمانـەكانی، ئایـا دەتـەوێ هـەروابژی كـەناخت ڕەشـبووە بـەهۆی زۆری تاوان، وەكاتێ كەمردی بەكۆڵێكی قورسی تاوان و ڕوویێكی ڕەش بچیـە بـەردەم خـوای رب العـالمین. ئایا چۆن شـەرمناكەی لەكاتێكـدا ئەو هەموو چاكەو نیعمەتەی پێ بەخشی بووی لەدنیا، لەوكاتە هیچ بیانیویـەكت نییـە بەرامبـەر بـەخوا كەپشـتگیری خـۆت پـێ بكـەی، چونكە ئەندامەكانت شایەدی ئەدەن لەسـەرت كە لـەدنیا چیت پێ ئەكرد كاری چاكە كە خوا لێی ڕازی بوو یان كارێك كە دڵی شـەیتانت پێ خۆش ئەكرد. كە جوانیت خۆت بۆ خەڵكی نامەحرەم دەرئەخست گەنجـەكانت سـەرقاڵ كردبـوو بـەوەی هـەموو ڕۆژ بێنـە سـەر ڕێگـات بەهۆی خۆ ڕازاندنەوەت .{يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ}[1] . واتـە: ڕۆژێك دێ شايەتی ئەدات لەسەريان زمانيـان و دەسـت و قاچـەكانيان بـەو كردەوانـەی كـە كردوويانـە. بـا وا بكـەين كەشـايەتی بـدەن لەسـەركارێك كـە بـۆ ڕەزامەنـدی خـوا كردوومانـە، باوانەكەين ئەندامـەكانی خۆمان لـە ڕۆژی دوايی سـەرمان شۆڕبكەن ڕيسواو شەرمەزار بين. بەڵێ ئەی ئەو كەسانەی دوور لەبەرنامەی خوا ئـەژين وەرن پـەيمان لـەگەڵ خوابـدەن تـا ئەوكاتـەی مـەرگ دەبێتـە ميـوان بۆخـوا بـژين هـيچ نائوميـد مـەبن لـەوەی كـە تـاوان و سەرپێچيتان زۆر كردووە، چونكە ڕەحمەتی خوا زۆر فراوانە

[1] النور .{24}

**{ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ }**[1]. واتـه: بـەزەیی و رەحمـەتم هـەموو شـتێكی گرتۆتـەوە . بۆكەسـانێك كـە ڕاسـتگۆبن لـەو پەیمانـەی كـە ئەیـدەن بەخوا بۆئەوەی نەگەڕێنەوە سەر تاوانەكانیان. كەوایە نا ئومێد مەبە ئەی بەندەی خوا لە زۆری تاوانەكانت ،**{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ)قَالَ: (لَمَّا قضى اللَّهُ الْخَلْقَ كَتَبَ فِي كِتَابِهِ على نفسه،فَهُوَ موضوع عِنْدَه: إن رَحْمَتِي تَغْلِب غَضَبِي}**[2].واتـه: أبو هريـره (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)فەرموویـەتی: (كـاتێ خـوا خـەڵكی دروستكرد لەنامەكەیدا لەسەر خۆی نوسیووە و لای خۆی دانراوە كە: بێگومان بەزەیی من زاڵە بەسەر خەشم و قینمدا. ئەی ئەوانەی بەشـەو ڕۆژ تـاوان ئەكـەن وەرن بگەڕێنـەوە بـۆ ژێـر ڕەحمـەتی خـوا بـا ژیانێكی خۆشتان پێ بدات لەوەی كەپێشتر هەتان بوو. وە خراپەكانت بـۆ ئـەگۆڕێت بەچاكـە تـا پێـت ببەخشێ بەهەشـتەكەی **{إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ}**[3]. واتـه: بێجگـە لـە كەسێ تەوبـەی كردبێ و بـاوەڕی هێنـابێ كـارو كـردەوەی چاكیشی كردبێت ئا ئەوانـە خـوا خراپـە و تاوانـەكانیان دەگۆڕێت بـە چاكە بزانە تۆزێك بیـــر بكەوە لە گەورەیی سۆز و ڕەحمی ئەو خوا تاك و تەنهایە لەپاش ئەوەی شەو و ڕۆژ غەرقی تاوان بووبووی وا پێت ڕادەگەیەنێ كە خراپەكانت بۆ ئەگۆڕم بەچاكە! بەڵام مرۆڤەكان زۆر

[1]الأعراف.{156}
[2]{صحيح مسلم}
[3]الفرقان .{70}

بێ وەفـاو سـپڵەن بەرامبـەر بـەخاڵقی خۆیـان بۆیـە تـاكو زووە مـردن لـەدەرگای نـەداوی زووكـە خێـرا ئـەی بـرای ئـازیز خوشـكی سـەنگینم تەوبـە بكـەو بگـەڕێوە، تاسـەركەوتن بەدەسـت بێنیـت .{**وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ**}[1]. واتـە: هـەمووتان تەوبـە بكـەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ئەی ئیمان دارەكان تا ڕزگار و سـەركەوتوو بن. گـەر ئەتـەوێ ڕەزامەنـدی خـوا بەدەسـتبێنی و پاشـان بچیـە بەهەشـت، دەبێـت تەوبەیـەكی ڕاسـتگۆیانە بكـەی یـەكجاری بێـت نەگەڕێیـەوە سەرتاوانەكانی پێشـوو.{**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَصُوحًا**}[2]. واتـە: ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە بگەڕێنـەوە بۆڵای خـوا بەتەوبـەو گەڕانەوەیەكی ئێجگاری بەشێوەیەك، ئیتر جارێكیتر نەگەڕێنەوە. گەر وامـان كـرد و گەڕایەنـەوە بـۆ لای خـوا بـە ئێجگـاری خۆشـی دنیامـان كـردە قوربـانی دواڕۆژمان . خـوای گـەورە داخلی بەهەشـتمان دەكات { **وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ**}[3].واتـە: تابتخاتـە باخـەكانی بەهەشـتەوە كـە چەنـداها و ڕووبـار بـەژێر درەخـت و كۆشـكەكانیدا دەڕوات، كەوایـە بـا لەوسـاتەوە بڕیاربـدەین واز لەوكارانـە بێنـین كـە نەفسـەكەمان هانمـان دەدات بۆكارێـك لـەكاتێك خـوا لـەوكارە ڕازی

[1] النور.{31}
[2] التحريم .{8}
[3] التحريم .{8}

نییە چونکە نەفس هانمان دەدات بۆ کاری خراپ {**إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ**}[1]. واتە: بەڕاستی نەفس زۆر فەرماندەرە بەخراپە.

زۆر پێویستە دڵەکانمان ئاوبدەین بە تەقواو لەخوا ترسان، چونکە گەر دڵەکانمان ترسی خوای لێ نیشت پاکمان کردەوە لەتاوان ئەوکات ئیمان کامڵ دەبێ دەبین بەموسڵمانێکی پاکی بۆخوا سولحاو. پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەفەرمووێ: {**أَلا وَإِنَّفِي الْجَسَدِ مُضْغَةًإِذَاصَلَحَتْ صَلَحَا لْجَسَدُ كُلُّهُ،وَإِذَافَسَدَتْفَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ،أَلاوَ هِيَا لْقَلْبُ**}[2].واتە: بزانە کە پارچە گۆشتێك لە دەروونی ئینساندا هەیە، گەر چاك بوو هەموو لاشەکە چاك ئەبێ، گەر بێ کەڵك و خراپیش بوو هەموو لەشی لەگەڵ خراپ ئەبێت کە ئەویش دڵە. بۆیە گەر دڵ ودەرونمان پاك نەکردەوە لەژەنگ و ژاری تاوان بێگومان بێ بەش ئەبین لە خۆشی بەهەشت و باخ و باخاتەکەی. ئەوجا بڕیار لەدەست خۆتە براوخوشکە بەڕێزەکان خۆت پاشە ڕۆژت دیاری دەکەی یان بەهەشت یا دۆزەخ خوا بمان پارێزێ دەبێتە شوێنی مانەوەی یەکجاری. کەوایە تەوبە بکەو وازبێنە لەتاوان بەهەشت بکە شوێنی مانەوەی یەکجاری گەربەدوایخۆشیت.

---

[1] یوسف .{53}
[2] {صحيح ابن ماجة}

# لە خزمەت سەرداری مرۆڤایەتی
# خۆنەویست و خۆشەویستی خوا

کاتێک ئەچینە خزمەت ئەو خۆنەویستە خوا ویستە خاکیە بۆئەوەی وەسف و باسی بخەینە گەرتا تۆزێك بۆمان ڕوون بیتەوە بزانین ئەمە چ خۆنەویستێکە لەکاتێکدا گەورەی ئوممەت بوو، ئەوا ئەقڵ لەڕاستی دا بێ هۆش و هەستە لە بیرکردنەوە. زمان لەوەسفکردنی داڕوخاوە، وشکبووە، ناتوانێ چیتر باس بکات. پەنجەکان توانای هەڵگرتنی نووکی قەڵەمیان نەماوە شەکەت و ماندووبوون ئەوەندەی بنوسن، تەواو نابێ لەوەسف و گەورەیی ئەم خواویستە دنیا نەویستە لە هەموو بوارێکەوە، ئەو خۆنەویستە پیغەمبەری نازدارە (ﷺ) کاتێ خوای گەورە کردی بە پێغەمبەر بوو بە ڕەحمەت بۆ مرۆڤەکان. بەڵام چ رەحمەتێک دنیای گۆڕی لە جاهیلیەت و نەزانی بۆ ڕێگای خۆشبەختی و کامەرانی، هەروەک خوای گەورە وەسفی دەکات بە ڕەحمەت بۆسەرجەم خەڵکی دەفەرموێت: {وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ}[1]. واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردووە کە ڕەحمەت بیت بۆ جیهانیان، بەڕاستی ڕەحمەت بووی کاتێ خەڵکی داروبەردیان ئەپەرست کەتۆ هاتی وشیارت کردنەوە کەسوودی نیە جگە لەپەرستنی خوای تاک و تەنها. بەڵێ ئەی

[1] الأنباء .{107}

پیغەمبەری خوا(ﷺ) تۆ چ ڕەحمەتێکی خوایی بوویت کاتێک کافر و دڵ نەخۆشـەکانی سـەردەم بەهـاتنی نـوری تـۆ بەیەکجـاری لەزەویـدا داڕووخـان و لەنـاو چـوون. بەرنـامەی خـوا کە ئیسـلامە گەشـایەوە لەسەر زەوی پاشان خوا بڕیاری دا دینی ئیسلام تاکە بەرنامەبێ خۆی لێ ڕازی بـێ جـگە لەو هەمـوو بەرنـامەیەکی تـر درۆیە و قبـوڵ نـیە {**وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا**}[1]. واتە: ڕازی بووم کە ئیسلام ئایینتان بێت. هەرکەسێك جگە لەبەرنامەی ئیسلام دوایی بەرنامەیەکی تر بکەوێ خەسارەتمەندی ڕۆژیدوایی دەبێت.{**وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْـهُ وَهُـوَ فِي الْآَخِـرَةِ مِـنَ الْخَاسِـرِينَ**}[2]. واتـە: هەرکەسێک دوای دینێـک بکـەوێت جگـە لـە دینی ئیسـلام ئـەوە لێیوەرنـاگیرێ وە ئـەو لـەڕۆژی دوایی دا لـە زەرەرمەندانە. بەڵێ خوای گەورە ئەم پیغەمبەرە (ﷺ) بۆ کـردین بەنـورو ڕوونـاکی تـا خەڵکی ئاگادار بکـاتەوە بە وازهێنـان لەو کردەوانەی سنووری خـوا دەبەزێنن و ئاشـنایان بکات بەفەرمانەکانی خـوا، بـۆئەوەی لەدوا ڕۆژدا بەژیـانێکی خـۆش بیانژیەنێـت بیانخـاتە بەهەشـتەوە. هەروەک خـوای گەورە دەفەرموویـت: {**وَدَاعِيًـا إِلَى اللَّـهِ بِإِذْنِـهِ وَسِـرَاجًا مُنِيـرًا**}[3]. واتە: هەروەهـا بـانگەواز دەکەی بـۆلای خـوا لەسەر مۆڵەتی ئەو، چرایەکی ڕووناکیشی بۆ سەرجەم سەرگەردانان. ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە (ﷺ) لەهەموو ڕوویەکەوە سەر مەشقە

---

[1] المائدة {3}
[2] ال عمران .{85}
[3] الأحزاب .{46}

هەرلەپێش ئەوەی خـوای گەورە بیکـات بەپێغەمبەر(ﷺ) بە(صادق و امـین) ناسـرابوو، لەنێـو خەڵکی واتە دەسـتپاك تـرین و ڕاسـتگۆترین کەس بوو. لەڕووی ڕەوشـت و ئەخلاقەوە باشـتیرین مرۆڤ بووە هەتا لەگەڵ منداڵ و پیـرو گەورەکانـدا، کاتێ بەلای منداڵانـدا تێپەڕ دەبوو سڵاوی لێـدەکردن جـوانترین ڕەوشـتی بەرامبەر بەخێزانەکانی پەیـڕەو دەکردبـۆ دەربڕینی خۆشـەویسـتی نـاوی (عـائیشـە)ی کـورت دەکـردەوە دەیفەرمـوو: (یاعــائش) بەشــیوەیەک ڕێــزی دەگــرتن کە بەنــاوی بـاوکییەوە بـانگی دەکـرد و دەیفەرمـوو: کچی صـدیق. بەڵام بەداخەوە بۆ پیاو و ئافرەتانی ئەم ڕۆژگارە کە ئەوەندە بێ ڕێزی بەیەک دەکەن و بۆمـاوەیەکی درێـژ قسـە لەگەڵ یەک نـاکەن ئەگەر ئێـوە دەتـانەوێ ژیــانێکی خۆشــتان هەبــێ لەگەڵ هاوســەرەکانتان ئەوا چــاو لەپیغەمـبەری خـوا (ﷺ) بـکەن کەچەنـد بە وەفـاو میهرەبـان بـووە لەگەڵ خێزانەکانیـدا یـاری وسـوعبەتی لەگەڵ کـردوون. وەرن بـا بەیەکەیەوە بچینە خزمەت دایکە (عائیشـە ڕەزای خـوای لێبێت) بە جـوانی لـە خزمەتیـدا گـوێ بگـرین کـە سـەربووردەی خـۆی لەگـەڵ پێغەمبـەری نـازدار(ﷺ) بـۆ بـاس بکـات کـە چـۆن خۆشەویسـتیەك لەنێوانیان هەبووە تا ئێمەش چاوی لێبکەین.

**{عَنْ عَائِشَةَ , قَالَتْ : خَرَجْتُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ وَأَنَا جَارِيَةٌ لَمْ أَحْمِلْ اللَّحْمَ وَلَمْ أَبْدُنْ , فَقَالَ لِلنَّاسِ : تَقَدَّمُوا فَتَقَدَّمُوا , ثُمَّ قَالَ لِي : تَعَالَيْ حَتَّى أُسَابِقَكِ فَسَابَقْتُهُ فَسَبَقْتُهُ فَسَكَتَ عَنِّي حَتَّى إِذَا حَمَلْتُ اللَّحْمَ وَبَدُنْتُ وَنَسِيتُ خَرَجْتُ مَعَهُ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ , فَقَالَ لِلنَّاسِ : تَقَدَّمُوا فَتَقَدَّمُوا ثُمَّ قَالَ : تَعَالَيْ حَتَّى أُسَابِقَكِ فَسَابَقْتُهُ فَسَبَقَنِي فَجَعَلَ يَضْحَكُ وَهُوَ يَقُولُ : هَذِهِ بِتِلْكَ}**[1].واتە: عائیشە دەڵێت: لەهەندێ سەفەردا لەگەڵ پیغەمبەری (ﷺ) خوادا بووم، هێشتا گۆشتم نەگرتبوو قەڵەو نەبووم، بەخەڵکی فەرموو: پیشبڕکێ بکەن، ئەوانیش کردیان، پاشان بەمنی وت: وەرە باپیشبڕکێت لەگەڵ بکەم،من پێشم دایەوە، بێ دەنگ بوو، تاکاتێ گۆشتم گرت و قەڵەو بووم، لەگەڵی ڕۆیشتم بۆهەندێ سەفەر، فەرمووی: بەخەڵک: پیشبڕکێ بکەن، ئەوانیش کردیان، پاشان بەمنی وت: وەرە با پیشبڕکێ بکەین ئەمجارە پێغەمبەر(ﷺ) پیش منی دایەوە، دەستی کرد بەپێکەنین و دەیفەرموو: ئەوجارە بەجاری پێشوو. سبحان الله لەو پێغەمبەرە نازدارە(ﷺ) بەڕاستی پیشەنگی ڕەوشت بەرزەکانە، خوای گەورە شاهیدی ئەو ڕەوشتەی دەکات دەفەرموویت: **{وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ}**[2].واتە: بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت وئەخلاقێکی ئێجگار بەرزو گەورەیت. بۆیە ئەی برایان و خوشکانم با چاو لەو پێغەمبەرە ئازیزە (ﷺ) بکەین تا تۆزێک هەست بەخۆشی دنیا بکەین.

---

[1] {رواه احمد}
[2] القلم .{4}

لەگەل ئەوەشدا ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) گەورەی دنیا بوو قائیدی ئۆممەت بوو سەرکردەی موسڵمانان بوو ئەی توانی خۆشترین ژیان بباتە سەر لەدنیا باشترین جل بکاتە بەری و خۆشترین خواردن بخوات، بەڵام بابچینە خزمەت دایکە عائیشە کەمێک باسی حاڵی ئەونازدارەمان بۆبکات تاکو بزانین ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) چۆن ژیاوە.

**عن عائشه (رضی الله عنها)زَوج النبِیّ (ﷺ)قَالَت: لَقَد مَاتَ رَسول اللهِ (ﷺ)وَمَا شَبِعَ مِن خبز وَزَیت فِی یَوم وَاحِد مَرتَینِ}**[1]. واتە: عائیشە هاوسەری پیغەمبەر (ﷺ)ڕەزای خوای لێ بێت فەرمووی: پێغەمبەری خوا (ﷺ)هەتا مرد نەبووە لەیەک ڕۆژدا دوو ژەم لەنان و ڕۆن زەیتون تێر بخوات. جاری وا هەبووە تا دوو مانگ ئاگر لەماڵەکانی خێزانەکانی پێغەمبەردا نەدەکرایەوە بۆنان و چێشت کردن! لە دایکە عائیشەیان پرسی: ئەی بەچی دەژیان، فەرمووی: بەخورما و ئاو! بەڵام چەند ماڵێکی ئەنساری جیرانی پێغەمبەر بوون ئاژەڵی بەشیریان هەبوو، بەدیاری بەشی پێغەمبەریان دەدا، پێغەمبەریش(ﷺ)لەوشیرە دەرخواردی ئێمەیدەدا. بەڵێ ئا ئەوەیە سەرکردە ئەوها ژیاوە هەتا لەدنیابوو نانێکی خۆشی نەخواردووە، بە پێچەوانەی ئەم سەرکردانەی ئێستا بەدرۆ ناویان لەخۆ ناوە سەرکردە بەزەبری هێزهاتوونەتە سەرحوکم و مافی خەڵکی هەژار دەخۆن لەسەر حیسابی گەل ئەژین دنیایان داگیر کردووە بەرزترین خانوویان هەیە،

[1] {صحیح مسلم}

خۆشـترین خـواردن ئەخـۆن، مـۆدێلی ئـاخیر سـەیارەیان هەیە، وا دەزانـن دنیـا بەس هی وانە هەروا بۆ ڕابـواردن دروسـتکراون. بـابچینە خـزمەت پێغەمبەری نـازدار(ﷺ)بـزانین حـاڵی ئەو سـەرکردە چۆن بـووە لەکاتێکـدا ئەویـش دەی تـوانی باشـتر لەمـانە بژیـت بـا بەیەکەوە سەیرێکی ماڵی ئەو پێغەمبەرە بکەین لەسەر چی نوستووە، **{دَخَلَ على رَسُول اللهِ(ﷺ) عُمَرَ بن الخَطاب (رضي الله عنه) ذاتَ يَوم فَوَجَدَ هُقَدْنامَ على حَصيرِوَأثّرَ الحَصيرَ في جَسَدِهِ،فبَكى عُمَرفَقالَ: لَهُمُ حَمَّدمَايُبْكِكَ؟قال عمَـر: يارَسُــول الله(ﷺ)، فَـإِنَّ كِسْـرى وَقَيصَـرفِيماهُمْ فِيهِـوَ أَنْـتَ رَسُــول الله(ﷺ).فَقـالَ :أَمَّاتَرضـى أَنْـتَ كُـون لَهُمُ الـدُّنْياوَلَنالآخِرة؟}**[1]. واتە:جارێـک عـومەری کوڕی خەتتاب ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لە سەر بێت ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)دیتی لە سەر (حەسیرێک) پاڵی داوەتەوە، شـوێنەواری (حەسـیرەکە) لە لاشـەی پێغەمـبەر (ﷺ)دەرکەوتـووە، عـومەر ڕەزا وڕەحمەتی خـوای لە سـەر بێـت گریـا ، پێغەمـبەریش(ﷺ) فەرمووی: بۆ ئەگریت؟وتی:ئەی پێغەمبەری خـوا(ﷺ) کیسـرا و قەیسـەر لە چی دان و تـۆش لە چی دایـت ئینجـا پێغەمـبەر (ﷺ)فەرمـووی: جـا ئەی عــومەر تــۆ حەز ناکەیــت ئەوان دنیایــان هەبێــت و ئــێمەش قیـامەت و دوا ڕۆژ. بەڵێ ئەو نـازدارە ژیـانی دنیـای فرۆشـت بـۆ بە دنیــایەکەی تــر چــونکە دەیزانــی ئەم دنیــایە ڕابــواردنێکی کەمە مانەوەمان کاتیە ئەوەی گرنگ بوو لای ئەو دنیاکەی تر بوو.

---

[1] {متفق علية}

{ إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْأَخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ}[1].واتە: بەڕاستی ژیانی ئەم دنیایە ڕابواردنێكی كەمە وە بەڕاستی هەر پاشەڕۆژ جێی حەسانەوەی هەمیشەییە. بۆیە زۆر خۆی ماندوو دەكرد زۆربەی كاتەكانی بەخوا پەرستی ئەبردە سەر، نەك تەنها بەڕابواردن و خۆشی، شەوانە چەندین حیمایە لە دەوری ماڵەكەی بن خۆشی بخەوێ ! نەخێر شەوانە بەئاگا بوو لەكاتێكدا خوای گەورە لەگوناهی پێش و دوایی خۆشبووە، ئەمەش وای لێ نەكردووە واز لەشەونوێژ بێنێت. باكەمێك دڵەكانمان لەژەنگی تاوان پاكبكەینەوە و بچینە خزمەت دایكی ئیمانداران تا كەمێك باسی لەخوا ترسی و خوا ناسی ئەو پیغەمبەرە(ﷺ) ئازیزەمان بۆبكات، عائیشە دەفەرمووێت: پیغەمبەری خوا (ﷺ)شەو هەڵدەستا تا قاچەكانی دەئاوسان، عائیشە پێی دەڵێت: ئەی پیغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ وا لەخۆت دەكەی، كە خوای گەورە لە هەموو گوناهێكی ڕابردوو و داهاتووت خۆشبوو؟ دەیفەرموو: {أَفَلاَأَكُونُ عَبْدًاشَكُورًا}[2]. واتە: ئەی نابێت بەندەیەكی سوپاسگوزار بم. بەڵێ ئەی برا یان و خوشكانی بەڕێزم ئەگەر ئیوە دەتانەوێ خوا لەخۆتان ڕازی بكەن گەر دەتانەوێ بەخۆشی بژین لەدنیا و پاداشتێكی گەورە تان بۆهەبێ لەدواڕۆژدا، ئەوا با چاو لەو پیغەمبەرە (ﷺ) خۆشەویستە بكەین كە مامۆستای مامۆستایانە،

[1] غافر.{39}
[2] {صحیح البخاری}

وەرن بـــابەیەكەوە ببـــین بە قوتـــابی ئەو پێغەمـــبەرە(ﷺ) نـــازدارە ســوننەتەكانی زینـدووبكەینەوە.{لَقَـدْ كَـانَ لَكُـمْ فِي رَسُـولِ اللَّـهِ أُسْـوَةٌ حَسَـنَةٌ}[1].واتە: سـوێند بەخـوا بەڕاسـتی لە پێغەمـبەری خـوادا (ﷺ)بـۆ ئێـوە هەیە سـەر مەشـقی و پێشـەوایەتی چـاك. كەوایە بـالە ئێسـتاوە بڕیاربـــدەین لەهەمـــوو كێشـــەو گرفتێكـــدا بگەڕێـــنەوە بـــۆلای ماﻣۆستاكەمان تـاجی سـەرونووری چاومان، بۆئەوەی لەڕۆژی دوایدا لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە(ﷺ)بین، بەڵێ بـرای بەڕێـزم خوشـكی سـەنگینم بەڕاستی ئەم پێغەمبەرە ئـازیزە (ﷺ)هـۆی ڕەحمەت ومیهرەبـانی بـوو بـۆ سـەرجەم خەڵكـی گەر ئێسـتا لەناومانبـایە حاڵمـان ئەوهـا نەدبـوو بێگومـان! لەپـاش ئەو هەمـوو فەزڵ و گەورەیـی ئەم نـازدارە لە دنیـا كـۆچی كـرد بـۆ شـوێن و مەكانی دواڕۆژ، هەر لەدنیـا نەمـایەوە هەتـا هەتـــایی. ئەی ئەوانەی بەدوای دنیـــا كەوتـــوونە دڵتـــان بەچـــی خۆشـدەكەن لەكاتێكـدا بـۆ ڕابەر و تـرپەی دڵمـان نەبـوو، ئیـوە چـین هەتـا داگیـر بـكەن پشـتان پـێ ببەسـتن؟ بـزانە خـوای گەورە بە سەركردەی ئوممەت چی دەفەرموویت: {إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ}[2]. واتە: ئەی محـمەد(ﷺ)بەڕاسـتی تـۆ دەمـری و ئەوانـیش دەمـرن. بەڵێ دنیـا بـۆگەورەی پێغەمـبەران نەبـوو ئەوجـا بـۆ كەس نـابێ، بـالە ئێسـتاوە

---

[1] الأحزاب .{21}
[2] الزمر .{30}

مەردی خـــوا بـــین بۆخـــوا بـــژین، لەفەرمانەکـانی خـــوا پاشـــان سوننەتەکانی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) دەرنەچین تاکو سەرکەوتوو بین. { وَمَـنْ يُطِـعِ اللَّـهَ وَرَسُـولَهُ فَقَـدْ فَـازَ فَـوْزًا عَظِيمًـا }[1]. واتە: هەر کەس گـوێڕایەڵی خـواو پێغەمـبەرەکەی بکـات ئەوە بەڕاسـتی سـەرکەوتنێکی گەورەی بەدەسـت هێنـاوە. بێگومـان ئەوەی گـوێڕایەڵی فەرمانەکـانی خـوا پاشـان پێغەمـبەر(ﷺ)بیـت بەڕاسـتی ئەوا ئەو کەسـە بـردیەوە و سـەرکەوتوو بـوو هەم لەقیـامەتیش بەکـامەرانی ئەژیـت و ئەبیـت بەجیرانـی پێغەمـبەری خـوا (ﷺ)لەبەهەشـت بـۆیە بـاهەوڵی بۆبـدەین بیرت نەچێ بوون بەجیرانی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) ماندووبوونی دەوێت لە دنیا.

[1] الأحزاب .{71}

# خۆشیەكاتییەكان

باكەمێك بچینە خزمەت ئەو خۆشیانەی كە ئەوكەسانەی ڕوویان لە دنیا كردووە ئالودەی بوونە! بالێ وردببینەوە تا بزانین ئەمە چ خۆشیەكە كە وای لێ كردوون لە بەرنامەی خوا دووربكەونەوە پشت لەدینی خوا بكەن لەژیانی ڕۆژانەیاندا.بەڕاستی براو خوشكانی من ڕابواردن و خۆشیەكانی دنیا هەمووی كاتین بەڵام كەسانێك نازانن لەو ڕاستیە بێئاگان، هەموو كاتێك بەخۆشیەكانی دنیا سەرقاڵبوونە. بە خانووی بەرز یا بەدوای مۆدیلی سەیارە كەوتوونە، یا ژنی جوان، یاخواردنی خۆش! دنیا ئەو كەسانەی بەخۆی غافڵكردووە، بەڵام نازانن ئەو شتانە هەمووی هی خۆیان نیە ماوەیەك لە لایان دەمێنێتەوە دەڕوات. بۆ نمونە: تۆ لەو دنیایە ئاواتت ئەوەیە ژنێكی جوان ببێتە هاوسەری ژیانت زۆر ماندوو ئەبی تایەكێك ئەدۆزیەوە كە بەدڵی خۆت بێت، بەڵام بیرتنەبوو كە ئەم جوانییە كە كچەكە هەیبوو بە دوای كەوتبوویت سەراپای ژیانت تەرخانكرد تا دۆزیتەوە بوو بە هاوسەرت نەتئەزانی ئەم جوانییە بۆ ماوەیەكی كاتیە گۆڕانكاری بەسەردێ و بابە زۆری بۆ 25 ساڵ بێت دواتر پیر ئەبیت، جوانییەكەی نامێنت تێبفكرە و بیربكەوە براكەم ئەمەیە سەر ئەنجامی ژنی جوان كە پیربوونە! یاخود بەدوای مۆدیلی سەیارە كەوتووی دەتەوێ كامەیان بەرزتر و گرانبەهاترە بیكڕی، خۆشی و جوانی ئەو سەیارەیە وات لێئەكات خۆت هەڵبكێشی بە سەر خەڵكی

و بە بچووك سەیریان بكەی بەڵام خۆشی و ڕابواردن لەگەڵی هەروا نابێت، ڕۆژگارێك بەسەردێت سەیارەكەت تێك ئەچێ مۆدیلی كۆن ئەبێت لەكار ئەكەوێت! ئەبێ فڕێی بدەی پاشەڕۆژ! برای بەرێز خوشكی ژیرم، با خۆشی و لەزەتی كەمی دنیا هەڵتنەخەڵەتێنێت، با خواردنی خۆش وات لێ نەكات خوات لە بیربچێ و یادینەكەی. ئایا بیرت كردۆتەوە كەوا ڕۆژێك دەتەوێ خۆشترین خواردن بخۆی؟ پێش چەند ڕۆژێك خۆتی بۆ ئامادە دەكەی تاچۆن چاكی بكەی و بێتە پێشت. ئەوجا پێش چەند سەعاتێك ئامادەبوونی لەسەر سفرەی خوان گەربێت و لەگەڵ هاوڕێیەكت بیت گفتوگۆ ئەكەی یان گەر هاتوو با لە دەوام بیت ئەوازۆرگرنگیان پێ نادەی نە بە هاوڕێكەت نە دەوامەكە، چونكە هەر بیرت لای خواردنەكەیە! لە دڵەوە خۆزگە ئەخوازی بچیەوە دەڵێی بڕۆمەوە بۆ ماڵ خۆشترین خواردنمان هەیە ئاوادەكەم و ئەوەی دەخۆم! بەڵام كە هاتییەوە هەر ئەوكاتەی لە سەر سفرەی خواردنی و خواردنەكە ئەخۆی و تەواو دەڕوات، تۆ پێش چەند سەعاتێك چاوەڕێت ئەكرد بەڵام وا ئێستا خواردت و ڕۆیشت پاش چەند سەعاتێك تامی خواردنە خۆشەكەت ئەڕوات و برسیت ئەبێتەوە، سبحانالله، بزانە ئەوەی لەدنیا دێتە دەستمان لە جوانی ، ناوبانگ ،مال و مناڵ ،پارە ..هتد هەمووی دەڕوا نامێنێت تەنها ئەوەی لای خوایە .

**{ مَا عِنْدَكُمْ يَنْفَدُ وَمَا عِنْدَ اللَّهِ بَاقٍ }**[1]. واتـه: هـەر چی لای ئێوەیە تەواو دەبێ و نـامێنی بـەڵام ئـەوەی لای خوایـه تـەواو نـابێ هـەر دەمێنێ. کەوابوو ئـەی برایـان و خوشـکانم خۆشی و نـاز و نیعمەتـەکانی دنیـا هـەمووی کـاتین بـۆ چی پێـی هەڵئەخەڵەتێـی! بـابچینـه خزمـەت پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) تا وەسفی خۆشی دنیامان بۆبکات.**{عَن مستورِدا (رضي الله عنه) قَالَ: قَال رسول اللَّهِ(ﷺ) (وَاللَّهِ مَا الدُنْيَا فِي الْآخِرة إِلَّا مِثل مَايَجْعَل أَحدكم إِصبَعَه هَذهِ فِي الْيَم،فَلْينظر بِمَتَرجِع}**[2]. واتـه: المستورد (خـوای لێـی ڕازی بێـت) دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: بـه خـوا دنیـا لـه چـاو دوارۆژدا هـیچ نییـه، مەگـەر ئەمەنـده نـەبێت کـه یـەکێك لـه ئێـوه ئـەم پەنجەیـەی بکات بـەناو دەریـادا، پاشـان سـەیر بکـات بزانـێ چەنـده ئـاو دەگرێتـه خـۆی. یـانی خۆشـی دنیـا هـەر ئەوەندەیـه گـەربێت و کەسـێك پەنجـەی بکـات بـەناو دەریایـەك ئایـا چەنـد ئاو هەڵئەگرێ چەنـد دڵۆپەیـەك دەبێت بە پەنجەکەوە، ئـەی بەندەکانی خوا خۆشی دنیا هەر ئەوەندەیە با بە هۆی ئەم دنیا کاتییە دنیـا بەنرخـه کـەیتر لەدەسـت نـەدەین کـه بەهەشـتی نەبڕاوەیـه. **{فَلَا تَغُـرَّنَّكُمُ الْحَيَـاةُ الـدُّنْيَا وَلَا يَغُـرَّنَّكُمْ بِاللَّـهِ الْغَـرُور}**[3]. واتـه بـا ژیـانی دنیـا هـەڵتان نەخەڵـەتێنێ وه باشـەیتانی فریـو دەر بـه (بیـانوی بـەزەیی و لێبوردنی) خوا نەتان خەڵەتێنێ. خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی کە بە

---

[1] النحل .{96}
[2] {صحيح مسلم}
[3] لقمان.{33}

دنیـاو خۆشـیەکانی هەڵناخەڵـەتێ بـۆ سـاتێکیش خـوا لـە بیرناکـات. دنیای لە پێش چاوی هیچ نیە و هەوڵ بۆ بەدەست هێنانی دنیاکەیتر ئەدات، کە سەد قات باشترە. گەر بێت و ماڵی دنیاشی هەبێت بۆ خوا بەکاری دێنێت و دەیکاتە قوربانی ئیسلامەکەی بۆ خزمەتی دینی خوا سەرفی ئەکات، بەڵێ ئەی بەندەکانی خوا با ئێمەش لەوانە بین کـە لـەم دنیـای کاتیـە بـۆ خـوا ئـەژین لەهـەموو چاکـەو خێرێـك بەژداربین کە مایەی ڕازی بوونی خوای لەگەڵ بێت. تا لە دوارۆژدا پاداشتێکی نەبینراومان پێ ببەخشێ {**لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ**}[1].واتـە: تـەنها پاداشـتیان لای پەروەردگاریانـە، ئەوسا نـەترس و بیمیـان لەسـەرە، نـە غـەم و پـەژارە دەیانگرێتـەوە. بـەهۆی ئـەوەی لـەدنیا سـەرپێچی خـوای گـەورەمان نـەدەکرد، لـە ئـاخیرەت پاداشـتێکی نـەبڕاوەمان بۆهەیـە بـەهۆی ئـەوەی پشـتیان لەخۆشـییەکانی دنیـا کردبوو.ئـەوکات بـەبێ خـەم و پـەژارە داخلی بەهەشت دەبین.

---

[1] البقرة .{277}

# هاوڕێت كێیە؟

مرۆڤەكان پێویستە هاوڕێیەكیان هەبێ لەژیان، ناكرێ بێ هاوڕێ ژیان بباتە سەر چونكە ئەم هاوڕێیە هاوبەشی خەم و ڕۆشنكەرەوەی ڕێگای ڕاستە. ئەمانەن هاوڕێی ڕاستەقینەن بۆ مرۆڤ. بۆیەش زۆر پێویستە لەسەر باوك و دایك كەوا هاوڕێیەكی چاك و پاك بۆمنداڵەكانیان بدۆزنەوە یان بیانكەنە ڕەفیقی ئەوكەسەی شایستەی هاوڕێیەتییە تا لە پاشەڕۆژ ببن بە كەسێكی چاك و دوارۆژێكی ڕۆشنیان هەبێ. چونكە مرۆڤ لەسەر دینی هاوڕێیەكەیەتی گەرباش بوو پاشەڕۆژت باش دەبێ دەبیە كەسێكی بەختەوەر، بەڵام گەر هاتوو هاوڕێ كەت خراپ بوو پشتی لەدینی خوا بوو ئەوا دوارۆژێكی باشت نابێ.پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)دەربارەی هاوڕێ دەفەرموویت: {**عن أبي هريرة قال:قال رسول الله** (ﷺ) **:الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْأَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلْ**}[1]. واتە: لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لەسەربێت) لەپێغەمبەرەوە(ﷺ)فەرموویەتی : مرۆڤ لەسەر ڕێبازی و دینی هاوڕێیەكەیەتی و هەر كەسێك لەئێوە بابزانێت هاوڕێیەكەی كێیەو تێكەڵ بەكێ دەبێت. براوخوشكانی من بەڕاستی ئەوانەی هاوڕێی خراپیان هەیە لەدنیاو قیامەت زەرەر ئەكەن لەژیان سەركەوتوو

[1] {رواه الرمذی}

نـابن، چونکـه لـەدنیا فـەرمانیان پـێ ئـەکردی بـەکاری خـراپ و بێفەرمانی خوا هیچی ترنەبوو! بابزانین حاڵی ئەوجۆرەکەسانە چۆنە لەقیامەت کەسەر شۆڕی وپەشیمانییە **{وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا}**[1]. واتە: ڕۆژێک دێت ستەمکارو تاوانبارەکـان قـەپ دەکـات بـە هەردوودەسـتی خـۆی دا و گـاز لــە هەردوودەستی خۆی دەگرێت لەپەشیمانیداودەڵێت: خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێبازی ئیمانم بگرتایە. بەڵێ تۆلەدنیا کەسانێکت کردبوو بـەهاوڕێی خـۆت کـەدژی بەرنامەکـەی خـوای پـەروەردگاربوون، وە کاتێك بانگ دەکرای پێیان دەووتی براکەم خوشکی من وازلەهاوڕێ دنیایی بێنە هیچ سوودی نییە بۆت بەڵام گوێت پێ نەئەدا **{يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا}**[2].واتـە: مـەرگ بۆخـۆم، خۆزگـە فلانکەسـم نەکردایەتـە هـاوەڵ و دۆسـتی خـۆم چونکـە سـەری لێ شـێواندم. بەڵێ هاوڕێی خراپیش ئاوایە لەدنیا کەسی دیندار هەبوو بەڵام هاوڕێیەتیت نەئــەکردن، ئــەچوویت هاوڕێیــەتی کەســانی خراپــت ئــەکرد بۆخۆشییەکی کەم کەکات کوشتن بوو بەبن دیواروکۆڵان و جگەرە کێشان...هتد، تا لەڕێگای ڕاست گومڕایان کردی بۆ ڕێگای شەیتان

---

[1] الفرقان.{27}
[2] الفرقان .{28}

{لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنْسَانِ خَذُولًا}[1].واتـە: بەڕاسـتی گـومڕاو وێڵی کـردم لەبەرنامـەی خـوا دوای ئەوەی پێم ڕاگەیەنرابوو، شـەیتان هەمیشـە و بەردەوام هانی مرۆڤ دەدات بـۆ گونـاە و تـاوان، لـەکاتی تەنگانەشـدا پشـتی بـەردەدات. ئەمەیـە سـەرئەنجامی دۆسـتی دنیـایی کـە قیامـەتت پـێ ئەدۆڕێنێ.باکەمێك بەئاگا بێینـەوە براوخوشکانی بەڕێزم دنیا ئەوندە ناهێنێ تابۆخۆشییەکی کەم ئاخیرەت بدۆڕێنی کەمانەوە لە قیامەت بۆیەکجارییە، ئەوجا لەدنیا هاوڕێیەکی چاك و دیندار بکە دۆست و ڕەفیقت چونکە هەرئەوانن مایەی خۆشی وبەختەوەری هەردوو دنیا پاشـان قیامـەت.{الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ}[2].واتـە: دۆسـتان وبرادەران هـەر هـەموو لـەو ڕۆژەدا دوژمنی یـەکترن، هـەموو ڕقیـان لەیـەك دەبێتـەوە، جگـە لـەو کەسـانەی کـە لەسـەر بنچینـەی تـەقواو خواناسـین کۆبوونەتـەوە و برایـەتی یـان بـەرپاکردووە. بۆیـە لەوسـاتەوە واز لەهاوڕێیەدنیایـەکان بێنـە ئەوانـەی هانـت دەدەن بۆکاری خراپ و دوورخستنەوەت لەڕێبازی خوا، ڕووبکە ئەودۆست و برایانـەی ئـەهلی ئیسـلام و مزگـەوتن تـا کـەمێك هەسـت بەخۆشـی دنیابکەی لەپاشە ڕۆژیش لەگەڵ دۆستانی خوا حەشر بکرێیت.

---

[1] الفرقان.{29}
[2] الزخرف.{67}

# نەخۆشیەكی كوشندە

لەم سەردەمەی غەریبی دا تاوانێك لەنێو موسڵمانەكان لەزیاد بوون و گەشەكردن دایە بەهۆی ئەوەی خۆیان پێ باشترو گرنگترە لە چاو براموسـڵمانەكەی، ئـەم جـۆرە كەسـانە هـاوڕێ یـەتی برایەكـی موسڵمانی بۆ خوا سولحاو دەكات بۆ خوا برایەتی ناكات بەڵكو بۆ هۆكـارێكی دنیـایی هاوڕێیـەتی دەكـات تـاكوو شـتێكی دنیـایی بـە دەستبێنێت، ئەم جۆرە كەسانە هیچ لەم ئیسلامە تێنەگەیشتوون بۆیە وا خراپن بەرامبەر بە برا موسڵمانەكەی. خوای گەورە مۆری لە دڵیانداوە هیچ تێناگەن {فَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ}[1]. واتە: ئیتر مۆری بەدبەختی نرابە سەر دڵیاندا جا ئەوان تێناگەن و حەقیقەت وەرنـاگرن ووشـە و مانـای خێر نـازانن، واتـە: چـاك وخـراپ لەیـەك ناكەنەوە . چەندە باسی مردن و قیامەتیان بۆ بكەی تێناگەن لەو گوێیە دەڕواتە ئەو گوێیە. ئەو جا بەداخەوە گەرهاتوو موسڵمانێك باسی خوا پاشان ئیسلام لە مەجلیسێك دەكات ئەو دڵ نەخۆشانە بێدەنگ نابن لەڕاست ئایەتەكانی خوا، لەولاوە لە گەڵ یەكتر باسی شتی دنیایی دەكات بۆ ئەوەی باسی ئایەتەكانی خوا نەكرێت. خوای رب العالمین باسی ئەو سیفاتەیان دەكات لە قورئانی پیرۆز هەروەك دەفەرمووێت:

---

[1] المنافیقون.{3}

{وَإِذَا ذُكِـرَ اللَّـهُ وَحْـدَهُ اشْـمَأَزَّتْ قُلُـوبُ الَّـذِينَ لَا يُؤْمِنُـونَ بِـالْآخِرَةِ وَإِذَا ذُكِـرَ الَّذِينَ مِنْ دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ}[1]. واته: كاتێک كه باسی تاكو تەنیایی خوا دەكرێ ئەوانەی كە باوەڕیان بەقیامەت و ڕۆژی دوایی نیە دڵیان پێتێكدەچێ و نێو چاوانیان گرژ دەبێ، بەڵام كاتێكیش با سی غەیری خـوا بكـرێ، ئـەوا دەم شـادو دڵخۆشـدەبن. ئـەم جـۆرە كەسـانە لـە سەرەوە دایم كەیفخۆشن لەگەڵ موسڵمانان بەڵام لە دڵەوە دژیان و هیچ كەیفیان بە براموسڵمانەكەیان نایەت، بەڵام بۆ ئەو كەسانەی كـە خوانـە ناسـن دایـم دەسـت لەسەرسـینگن ودەڵـێن پێیـان ئێمـە لەخزمەتداین بۆ ئێوە، وە دژی موسڵمانانن هەردەم نەخۆشن، هیچ پێیـان خـۆش نیـە ئیسـلام و موسـڵمانان سـەربكەون. بـەڵام خـوای پـەروەردگار ئاواتەكـەیان ناهێنێتـە دی نەخۆشـییەكەیان زیـاد دەكـات بـەوەی موسـڵمانان سـەردەخات.{فِي قُلُـوبِهِمْ مَـرَضٌ فَـزَادَهُمُ اللَّـهُ مَرَضًـا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ}[2].واتە: ئەوانە لە دڵ و دەروونیان دا نەخۆشـی بێبـاوەڕی و حەسـوودی و ڕق و كینـە هەیـە، خـواش نەخۆشـیەكەیان زیـاد دەكات بەسـەر خسـتنی حـەق و موسـڵمانان، عەزابێكی سەخت لە دنیا و قیامەت چاوەڕێیانە بە هۆی درۆكردن و دژایـەتی كردنیـان بۆ ئیسلام. كاتێك دەبێتـە مـانگی ڕەمەزان هـەرپێنج نـوێژ بـە جەماعـەت دەكـەن تـاكوو بڵـێن بەڕاسـتی كەسـێكی چاكـە،

[1] الزمر.{45}
[2] البقرة.{10}

كـاتێكیش ڕەمـەزان تـەواو دەبێـت نەخۆشـیيەكەیان جـارێكیتر سـەرهەڵدەداتەوە دڵـەكانیان بـۆ دنیـا لێدەداتـەوە هـەروەكو جـاری پێشتری لێدێتەوە! ئەوكەسانەكەوادڵیان نەخۆشە بەرامبەربە ئیسلام و موسـڵمانان عـەزابێكی سـەختیان بۆهەیـە. هـەروەك خـوای گەورەدەفەرمووێت: {بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا}[1]. واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) مژدە بدە بە دڵ نەخۆشەكان ئەوانەی دووڕوون بەوەی كە بەڕاستی سزایەكی بە ئێشیان بۆ ئامادەكراوە، تیاچوون بۆ ئەو كەسـانەی كـە دەزانـن دژی موسـڵمانان بـەڵام وازنـاهێنن لـە دژایەتیكردنیان بابزانن كەوا لە دواڕۆژدا ناخۆشترین شوێنیان هەیە كە تەبەقی هەرەخوارەوەی دۆزەخە خوا پەنامان بدات. {إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا}[2]. واتە: بابزانن بەڕاستی دووڕووەكان لـە خانـە و تەبـەقی هـەرە ژێـرەوەی ئـاگردان، وە هـەرگیز ڕزگار كەرێكت بۆ ئەوان دەستناكەوێت. ئەوكەسانەهیوایەتیان بەس ڕابـواردن و گاڵتەیـە لـە دنیـا بەڕاسـتی دڵیـان زۆر ڕەقـە بەرامبـەر بەموسڵمانێكی خۆنەویستی خواویست. گەربێت و ئەو برا موسڵمانە شـتێكی دنیـایی هـەبێت بـۆ نمونـە: سـەعاتێكی هـەبێت، یـان هـەر شـێك...هتد ئەوكەسـەزۆری پێناخۆشـە كـەوا هەیـە تـی چونكـە دڵی پیسـە بەرامبەری هـەردەم دەیەوێ شتی خۆی چاكتربێ لەهی خەڵكی.

---

[1] النساء.{138}
[2] النساء.{145}

ئەم جۆرە کەسانە هیچ ترسی خوایان لە دڵ نیە، ئەمانە کەسانێکن زۆر موتەکەبیرن و خۆیان پێگەورەیە لە ئاست موسڵمانان. بێ ئاگان لە ئامۆژگارییەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەربارەی ئەوانەی کەوا کیبر لەدڵ یانە کەناچنە بەهەشت .{**لايَدخُل الْجَنَّةَ مَنكَ انَ فِيقَلْ بِه مِثْقَال ذَرة مِـن كِبـرٍ**}[1] .واتـە: پێغەمبـەر(ﷺ)دەفەرمووێـت: ناچێتـە بەهەشـت ئەوکەسەی ئەگەر بە قەد مسقالە زەڕەیەك لە ناو دڵی کیبر هەبێ. ئەی ئەو کەسانەی دڵ تان پڕە لە قین و بوغز بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان وازبێنن لە دژایەتی، دڵەکانتان خاوێن بکەنەوە بەباشترین دەرمانی سەر ڕووی زەوی قورئانەکەی رب العالمین. خۆتان ناونووس بکەن لـە قوتابخانـەی ئاکارو ڕەوشـتی پێغەمبـەری نـازدار(ﷺ) چونکـە ئـەوە باشـترین چارەسـەرە بـۆ ئێـوە گـەر بـزانن، ئـەوجا تـاکوو زووە بگەڕێنەوە باوەشی ئیسلام و دڵـەکانتان تەسلیمی بەخوای تاکو تەنها بکـەن چونکـە گـەر خۆتـانیش تەسـلیم نەکـەن ئـەوا بێگومـان ڕۆژێك دادێت دەگەڕێیە وە لای خوای پەروەردگار.

{**وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنْصَرُونَ**}[2].

واتە: بگەڕێنەوە لای خواو خۆتان تەسلیم بکەن هەتاکو عەزابتان بۆ نەهاتووە، چونکە کەس نیە سەرتان بخات و پشتتان بێت.

[1] {صحيح مسلم}

[2] الزمر.{54}

کەوا بوو بڕیار بدە لەژیان کە تەنها بۆ ڕەزامەندی خوا تێبکۆشی تا پاداشتمان بەهەشتبێت لەقیامەتدا .

**گەر هاتوومومسڵمانێك باسی خوا پاشان ئیسلام لەمەجلیسێك دەكات ئەو دڵ نەخۆشانە بێدەنگ نابن لەڕاست ئایەتەكانی خوا، لەو لاوە لەگەڵ یەكتر باسی شتی دنیایی دەكات بۆئەوەی باسی ئایەتەكانی خوا نەكرێت.**

# واجبێكی فەرامۆشكراو

یەكێك لە فەرزەكان واتە واجب كە زۆر پشت گوێ خراوە بریتیە لە "نـوێژ" دووەم بنچینەیە لە ئیسلام ، **{بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ : شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَــهَ إِلاَّ اللَّــهُ وَأَنَّ مُحَمَّــداً رَسُــولُ اللَّــهِ، وَإِقَــامِ الصَّــلاَةِ، }**[1]. واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرمووێ :ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە: شایەتی دان بەوەی كەوا هیچ پەرستراویک نییە شایەنی پەرستن بێت بەڕاستی جگە لە (الله)، وەموحەممەدیش نێرراو و پێغەمبەری (الله) یە، و نـویژ كـردن . لەپاش شـەهادە (أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ وَأَنَّ مُحَمَّـداً رَسُولُ اللَّه) كەتۆشەهادەت هێنا هاتییە نێوبازنەی ئیسلام ،ڕازیبووی كە ئیسلام بەرنامەتێ دەبێ پابەندبی بە بەرنامەكەت واتە واجبەكان جێبەجێبكەی.بـەڵام لەمڕۆژگـارە بەهـۆی غـافڵبوونی مرۆڤەكـان بەكاروبـاری دنیـایی و سـەرقالبون بەشتەلاوەكیەكان (بەكۆكردنەوەی پـارە ، ڕابـواردن لەشـەقاموناوپاركەكان ، كـات بەفیـرۆدان بەیارییەئەلـەكترۆنیەكان ، بەدرێـژای شـەومانەوە لەیانەكان ...هتـد) لەبەر ئەم هۆكارانە بـۆیەگرینگی بەنوێژەكانی نـادات بەپێی ئەوكات و سـاتەی كـە خـوای پەروەردگار واجبیكـردووە. **{إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَـتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَوْقُوتًا}**[2]. واتە: چـونكە بەڕاسـتی نـوێژ لەسـەر ئیماندارا ن فەرزە لەكاتی دیاریكراودا دەبێ ئەنجام بدرێت. بەڵام بەپێچەوانـەوە

---

[1] {متفق علية}

[2] النساء.{103}

زۆربەی خەڵكی بێخەمن لەئاست نوێژەكانیان ، كەچی لە قیامەت یەكەم پرسیار دەربارەی نوێژە گەرهاتوو نوێژەكانت لەكاتی خۆی جێبەجێكردبێ وازت لێ نەهێنابێ ئەوەسەركەوتوو دەبی كارو كردەوەكانی تریش باش دەبێت لە تاقیكردنەوەی قیامەت.پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرمووێ **{أَوَّل ما يُحَاسَبُ بهِ العبدُ يومَ القيامةِ الصلاة، فإنْ صَلحَتْ صَلحَ لَهُ سَائِرُ عَمَلِهِ، وإِنْ فسَدَتْ فَسَدَ سَائِرُ عَمَلِهِ}**[1]. واتە: یەكەم شتێ بەندە لە قیامەتدا موحاسەبەی دەكەن لە سەری نوێژە ئەگەر نوێژەكانی پەسەند و تەواو بوون ئەوا كردەوەكانی تریشی چاك و تەواو دەبن و سەرفراز دەبێت ئەگەر خراپ ئەنجامی دابوون و تەواو نەبوون ئەوا كردەوەكانی تریشی خراپ و ناتەواو دەبن ئەوكاتە دۆڕاوو پەشیمانە . بۆیە وامەكە پەشیمانبی قیامەت بدۆڕێنی هەردەم پەیوەستبە بەمزگەوتەوە تالەقیامەت لەژێر سێبەری خوا حەشر بكرێی لەكاتێك هیچ سێبەرێك نیە .**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ {سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ، يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي المَسَاجِدِ، }**[2]. واتە : لە ئەبوهوڕیرەوە(ڕەزای خوای لەسەربێت)لەپێغەمبەرەوە(ﷺ)دەفەرمووێ: حەوت كۆمەڵ هەن كە لە ژێر سێبەری خوای گەورە دا حەشر دەكرێن كە لەوڕۆژە دا هیچ سێبەرێك نیە تەنها سێبەری خوای گەورە نەبێت: وە كەسێك كە

[1] {رواه الطبراني}
[2] {صحيح البخارى}

دڵی بەسترابێتەوە بە مزگەوت . موسڵمانی ڕاستگۆی شوێنکەوتەی سەر ڕاستی ئیسلام دەبێ جیاوازبێ لەکەسانێك کەبۆدنیا ئەژین وشەوانە تادرەنگ بەدیار(تۆپانێ و فلیمی دۆبلاژکراو ، مانەوە لەیانەکانی شەوانە کات بەسەربردن بەقومار..هتد بەڵام موسڵمانی لەخواترس خەمی نوێژەکانیەتی هەرزوو بەرەو مزگەوت دەڕوات تابە ڕێزییەکەم بگات بۆنوێژەکانی چونکە سوننەتەکانی پێغەمبەری نازدار (ﷺ)دەکاتە سەرمەشق تا سەرفرازبێ لە قیامەتدا .

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)قَالَ {لَوْ تَعْلَمُونَ-أَوْ يَعْلَمُونَ-مَا فِي الصَّفِّ الْمُقَدَّمِ لَكَانَتْ قُرْعَةً}**[1].واتە : لە ئەبوهوڕیڕەوە(ڕەزای خوای لەسەربێت)لەپیغەمبەرەوە(ﷺ)فەرموویەتی:ئەگەر-خەڵکی-بیان زانیایە چ خێرێك لەڕیزی پێشەوە دا هەیە ئەوا دەبوایە تیروپشکیان بۆ بکردایە کە کێ بچێتە پێشەوە .بەڵێ بۆیە هەوڵدەدات لەهەموو نوێژەکان لەڕێزی یەکەم بێ تا لە خیرەکە بێبەش نەبێ . ئەوکەسانەی بەردەوامن لەسەر نوێژکردن زۆر دوورن لەکاری خراپ کەسانێکن ئارام و لەسەرخۆن .**{إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ}**[2].واتە:بێگومان نوێژ بەرگری دەکات لە کاری ناشرین و ناپەسەند (خراپە). چونکە گەر کەسێك پابەندبێت بەنوێژەکانی دووری دەخاتەوە لەتاوان و سەرپێچی بۆنمونە: گەر لەشوێنك

[1]{صحيح مسلم}
[2]العنكبوت.{45}

كاربكات هەركە بوو بەكاتی بانگ واز لەكارەكەیدێنیت ترسی خوای گەورە لەدڵیەتی نەكا نوێژی بڕوات بەرەو مزگەوت دەڕوات تانوێژەكەی بەجەماعەتبكات . ئەمەش هۆكارێكە بۆ چوونە بەهەشت بەرزبوونەوەی پلەی لای خوای پەروەردگار.{مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ، ثُمَّ مَضى إِلَى بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ، لِيَقْضِيَ فَرِيضَةً مِنْ فَرَائِضِ اللَّهِ، كَانَتْ خَطْوَاتهُ إِحْدَاها تَحُطُّ خَطِيئَةً، وَالأُخْرَى تَرْفَعُ دَرَجَةً}[1].واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمویەتی: هەركەس لەماڵەوە دەستنوێژ بشوات وپاشان بچێت بۆ مزگەوت بۆ ئەنجامدانی نوێژێكی فەرز، هەموو دوو هەنگاوێك كە دەینێت، هەنگاوێكیان تاوانێكی دەسڕێتەوەو هەنگاوەكەی تری پلەیەك بەرزی دەكاتەوە. نوێژ واجبێكی زۆر گەورەیە لەئیسلام بەنەكردنی نوێژ واتە وازهێنانو تەركردنی مرۆڤ دەباتبەرەو دۆزەخ ، ئەهلی بەهەشت پرسیار لەدۆزەخییەكان دەكەن لەقیامەتدا كاتێك لەدۆزەخن خواپەنامان بدات ، {مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ}[2]. واتە: ئەوە چی بوو ئێوەیڕاپێچی دۆزەخ كرد؟! لەوڵامدا پێیان دەڵێن ،{قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ}[3].واتە:ئەوانیش وتیان: ئێمە لە نوێژ كەران نەبووین . بۆیە زۆرئاگاداری نوێژەكانبن تابەهەشت لەدەست نەدەین ، ئەی براو خوشكانی خواویستم گەردەتان هەوێ سەركەوتوو بن لەدنیا و دواڕۆژ وازلەنوێژەكانتان

[1] {صحيح مسلم}
[2] المدثر.{42}
[3] المدثر.{43}

نەهێنن ، خوای گەورە باسی سیفاتی ئەهلی فیردەوس دەكا ئەوانەی موسڵمانی سەركەوتوون،{قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ}[1].واتە:بە ڕاستی ئەو بڕوادارانە سەركەوتوو سەرفراز بوون. ئەوانەی بەردەومن لەسەر نوێژەكانیان و بەزەلیلی و خشوعەوە بەرامبەر خوای پەروەردگار ئەوەستێن {الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ}[2].واتە: ئەو كەسانەی كە لە نوێژەكانیاندا لەخوا ترسن (گەردن كەچن) بۆخوا.ئەوانەی بەنوێژەكانیان ماندوو ئەبن لەخۆشی و ناخۆشی سەرماو گەرما ئا ئەوانە تەنها بەهەشتیانە {أُولَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ}[3] . واتە:ئا ئەوانە میراتگران و خاوەنانی بەهەشتن. كاتێك لە شەوە ساردەكانی وەرزی زستان هەڵدەستا لە ناوجێگای گەرم بۆنوێژی بەیانی بەئاوی سارد دەست نوێژی ئەشوشت لەپێناو خوای گەورە ، بەلاّم كەسانێك هەرگوێیان بەنوێژەكانیان نەئەدا تانیوەرۆ هەر ئەخەوتن ، كەچی ئەو ترسی گۆڕ و بەرزەخ خەوی خۆشی لێ دەبڕی بۆیە ئەوكەسانە جێگایان بەهەشتی فیردەوسە {الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ}[4].واتە: ئەوانە دەبنە خاوەنی (فیردەوسی) بەهەشتی بڵند و بەمیرات ئەیبەن، چونكە ڕەنج و ئازارێكی زۆریان بۆ كێشاوە، بۆیەجگە لەوان كەسێكیتر شیاوی ئەوە نیە بەهەتا هەتاییش تیایا

[1] المؤمنون.{1}
[2] المؤمنون.{2}
[3] المؤمنون.{10}
[4] المؤمنون.{11}

ئەمێننەوە. هەرکەس بەدوای ژیانێکی خۆشبگەڕێ لەم دنیایە تەنها دەمێنێتەوە بێئەوەی خۆشی ببینێت چونکە ئەم ژیانە هەمووی ماندو بوونە . تا نەمردووی چاکەبکە بۆخۆت تا پاداشت وەربگری لای خوای گەورە بۆیە پەیوەستبە بەنوێژەکانت تاژیانێکی خۆشبەسەر ببەی لەقیامەت .

**کاتێک لە شەوە ساردەکانی وەرزی زستان هەڵدەستا لە ناوجێگای گەرم بۆنوێژی بەیانی بەئاوی سارد دەست نوێژی ئەشوشت لەپێناو خوای گەورە**

## بەرەوبەهەشت

لەژیـانی دنیـا حـالی بـووین کەخـوای گەورە بـۆ ئەوە دروسـتی کـردوە تاوەکو مرۆڤەکان تاقیبکاتەوە، بە هەبوونی و نەبوونی بە نەخۆشی و لـەش سـاغی و بە هەژاری و دەوڵەمەنـدی و بەکورسـی و دەسـەڵات ..هتـد بەزۆر شـتیتر کە لە ژیـان ڕوودەدات. {وَلَنَبْلُـوَنَّكُمْ بِشَـيْءٍ مِـنَ الْخَـوْفِ وَالْجُـوعِ وَنَقْـصٍ مِـنَ الْأَمْـوَالِ وَالْأَنْفُـسِ وَالثَّمَـرَاتِ}[1].واتە: سـوێند بەخـوا تاقیتـان دەکەیـنەوە بە کەمێـك لە تـرس و بـیم و برسـێتی و کەمبـــوونی مـــاڵ و ســـامان و مردنـــی کەس و کـــار و تیـــاچوونی بەروبـــوومی کشـــتوکاڵ . ئەم ڕووداوانە هەمـــوو لە دنیـــا بەســـەر مرۆڤەکـان دادێـت تـاوەک مرۆڤی ئیمانـدار و بێباوڕەکـان لە یەک جیـابکرێنەوە بە گـوێڕایەڵی و سـەرپێچی کردنـی فەرمانەکـانی خـوای پەروەردگـــار. دوو شـــوێن ئامـــادەکراون لەلایەن خـــوای گەورە لەپاداشتی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و بێفەرمانی کردنی خوای تاك و تەنها ئەم دوو شوێنە (بەهەشـت و دۆزەخ )ن بـۆ بەنـدەکانی. دەبێ ئـێمەی موسـڵمان بـزانین چـۆن بەرە و بەهەشـت بـڕۆین واتە چـی بکەیـن تـا بە دسـتبێنن چـونکە بەهەشت بە ئاسـانی بە دەسـتنایێ بە دوورکـات نـوێژ و ڕۆژوو تـەواو دەچمـە بەهەشـت، نـەخێر بـەڵکو شـــەونخونیوماندووبوونیدەوێتئەزیەت و ئـــازاری دەوێ تـــاعەت

[1] البقرة.{155}

وگوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا پاشان پێغەمبەری ئازیزی (ﷺ) دەوێت عَن أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُول اللَّهِ(ﷺ)قَالَ {حُجِبَتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ،وَحُجِبَتِ الجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ}[1].واتە: : لەئەبوهوڕیرەوە (ڕەزای خوای لەسەربێت) لەپێغەمبەریخوا(ﷺ)فەرموویەتی :دۆزەخ دەورە دراوە بەئارەزووو هەوەسبازی, وەبەهەشت دەورەدراوە بەناخۆشی وناڕەحەتی. بەڵێ برا و خوشکەسەنگینەکان منابێ ئێمە وا بیربکەینەوە کە بەهەشت بە ئاسانی وە دەستدێ وئەوەی تاوان و سەرپێچییە ئەنجامی بدەین و یا دیوزکری خوایگەورە لەبیربکەین. لەدنیاچۆن دەت هەوێ پلە و پایە و مەنسەب بەدەست بێنی هەوڵو کۆششی بۆ ئەکەی ! چوونبەرەوبەهەشتووەدەستهێنانیەروەکئەمەیە ! بۆنمونە: تۆقوتابی لە قوتابخانە دەبێ خۆتماندووبکەی تا کو دەرچی دە بێ واجبەکانت بە باشی جێبەجێبکەی کە مامۆستاکەت واجبی پێداوی، وەقوتابیەکی پاکوخاوێن ئاقڵ وژیربیت لەفەرمانی مامۆستاکەت دەرنەچی تاکو لەبڕی زیرەکی وئاقڵیت ..هتد دەرجەیەکی بەرزت پێبدات دوا ڕۆژێکی گەشت هەبێ ! بەپێچەوانە گەر هاتوو قوتابیەکی گوێنەداربووی پاکوخاوێن نەبوی واجبەکانت جێبەجێ نەکرد بێگومان مامۆستاکەت هیچ دەرەجەیەکی وات پێنادات دڵت پێخۆشبێ ودەرچی پاشەڕۆژێکی پڕشنگدارت هەبێ !.کۆششکردن لە دونیا بۆ بەدەستهێنانی بەهەشت هەروەك ئەم نمونەیە گەرتۆش ئەیبەندەی

[1] {صحیح البخاری}

خوا هەوڵو تێکۆشان نەکەی بەپیشە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە پاشان چوونە بەهەشت، بێگومان وەك قوتابییە بێخەمەکە دەرناچی و پاشە ڕۆژت ئەفەوتێ بێبەشئەبیلەچونەبەهەشت . چونکەناگونجێ خوایگەورە لە بیرب کەی لەدنیا هەر خەریکی تاوان وسەرپێچیبی {وَلَاتَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنْسَاهُمْ أَنْفُسَهُمْ}[1]. واتە: نەکەن وەکو ئەوکەسانە بن کە خوایان فەرامۆشکرد، شوێنی بەرنامەکەی نەکەوتن،خوایش ئەوانی لە بیر خۆیان بردەوە . دەبێ هەردەم مەردی مەیدان بین لەجێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوای پەروەردگار پاشان نەفس و ئارەزووی خۆمان تەسلیم بکەین تا ڕەزامەندی خوابکەین بەسەرچاوە بۆ چوونە بەهەشت. {وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى}[2]واتە: بەڵام ئەوەی لە پایە و شکۆی پەروەردگاری ترسا بێت و حیسابی بۆکرد بێت و جڵەوی نەفسی گرتبێتەوە لە هەموو هەواو هەوەس و ئارەزوویەکی نادروست. ئەو کەسانە پاداشتیان لەلایەن خوای گەورەیە. بێگومان بۆئەم کەسانە تەنها بەهەشت پاداشتیانە.{فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى}[3]. واتە: بێگومان هەر بەهەشت جێگەی مانەوە و حەوانەوە و گوزەرانیەتی. بۆیە با خۆمان ماندوو بکەین بۆ جێگە و مەکانێك کە هەمووی خۆشی و ڕابواردنە لەبری ماندوو بوونی دنیا

[1] الحشر.{19}
[2] النازعات.{40}
[3] النازعات.{41}

كە لە پێناو خوای گەورە ئەنجامان ئەدا ، بۆیە تا بەدەست بێنین كەشوێنی مانەوەی یەكجارەكیە بۆ بەندەكانی خوا كەبەهەشتە . بەڵام بۆ كەسانێكی تاوانبار جێگایان ناو ئاگرە خەجالەت ئەبن لە قیامەتدا بەهۆی پشتكردنیان لە فەرمانەكانی خوا {لَا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمُ الْفَائِزُونَ}[1]. واتە:(بێگومان) نیشتەجێكانی دۆزەخ وەك بەهەشتیەكان نین، چونكە هەر بەهەشتیەكان سەرفراز و كامەران و بەختەوەرن. ئەی برا و خوشكانی بەڕێزم بەكردەوە باشەكان خۆت چەكداربكە دژ بەشەیتان لە دنیا تاپاشەڕۆژت ڕووناك بكەیەوە بە چوونە بەهەشت.

**دەبێ هەردەم مەردی مەیدان بین لەجێبەجێكردنی فەرمانەكانی خوای پەروەردگار پاشان نەفس وئارەزووی خۆمان تەسلیم بكەین تا ڕەزامەندی خوا بكەین بەسەرچاوە بۆ چوونە بەهەشت.**

[1] الحشر.{20}

# پاداشتی بێ وێنە

فـەزڵ و پاداشـتی موسـلمانی شـوێن کەوتـەی سـەر ڕاسـتی ئیسـلام لـەلایـەن خـوای پـەروەردگار بـۆ بەندەکـەی تـەنها بەهەشـتە . خـوای گەورە لەبڕی ئەو کۆششەی کە لە دنیا شەونخونی و ماندووبونی بۆ ئەکرد. خـەمی ئـەوە ی نـەبوو کـە لـە دنیـا هـەژارە، جـل و بـەرگێکی جوانی نیە یا سەیارەکی مۆدیل بەرزی نیە یا خانوویەکی چەندقاتی نیە یا خـواردنێکی خـۆش ..هتـد پێغـەمبـەری خـوا (ﷺ)دەفـەرموێ: {فَـإِنَّ عِبَادَاللَّــهِ لَيْسُــوابِالْمُتَنَعِّمِينَ}[1]. واتــە: بەنــدەکانی خــوا زۆر لــە نــاز و خۆشـیەکانی دنیـا بەخـەم نـین . وەکـو خەڵکیتر کە لە خۆشی دنیـا غەرق ببوون تەنها ئامانجیان ڕابواردن و ژنی جوان و مۆدیلی سەیارە بوو. بەڵام ئەم بەندەیە بۆ خوا سولحاو بوو، خۆشی و ڕابوردنی دنیا پەرسـتان لەڕێگـای خـوای گەورە نەیتـوانی گـومڕای بکـات هەردەم مەردی مەیـدان بـوو لە خواپەرستی .{لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي الْبِلَادِ}[2].واتە: لەخشتەت نەبات فریوت نەدا هاتوو چۆی ئەوانەی بێ بـڕوان بەخۆشی و ئاسـوودەیی و ڕابـواردن لە وڵاتـدا. چـونکە دەیزانی خۆشی ئەو کەسانەی پشتیان لە بەرنامەکەی خـوای گەورەکـردووە کاتیە لە دواڕۆژدا دۆڕاون .

---

[1]{رواه احمد}
[2]ال عمران.{196}

**{مَتَاعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ}**[1]. واتە: ئەو ئاسوودەییەی ئەوان بەدوای کەوتوونە خۆشییەکی کەمە پاشان جێو شوێنیان دۆزەخە ئای چ شوێنێکی بەدە! بەڵکو بۆ دنیا کەیتر هەولیدەدا بێگومان بوو لەوەی ژیان بەسەر بردن لە دوارۆژدا بێ کۆتاییە و بەردەوامترە . برا و خوشکانی بەڕێزم دەبێ بزانین موسڵمانی باوەڕدار و بێ باوەڕ وەك یەك نین لە قیامەت لە ئەجر و پاداشت جیاوازن بۆیە گەر تۆ ئەهلی مزگەوت و تەوحید بی پابەندبیت بە واجبەکانت کە لە قورئان و سونەتی پێغەمبەری نازدار (ﷺ) ئاماژە پێکراوە جێبەجێتکرد، ئەوە تۆ نە جاحەتت هێنا لە دنیا خەمی ئەوەت نەبێ کە ئەو کەسانەی وەك تۆ نین ئەهلی بندیوار و خۆشی و ڕابواردنن ئەوەی تاوانە بۆتەپیشە یان و دەیکەن. **{أَفَمَنْ كَانَ مُؤْمِنًا كَمَنْ كَانَ فَاسِقًا لَا يَسْتَوُونَ}**[2]. واتە: ئایائەوکەسەی ئیماندار بوو بێت وەك ئەو کەسەیە کە تاوانبار بوو بێت؟ وەك یەك نین. بێگومان جیاوازن بۆ نمونە: تۆ کارێك بۆ کەسێك دەکەی ماندوو دەبی تا کارەکە دەکەی بۆ خاوەنەکە بەڵام کەسێکی تر بێت لات دانیشت لە شوێنی کارەکە پاڵداتەوە هەر بەس بخوات خاوەنی کارەکە ئایە پاداشتی هەردووکەس وەك یەك دەدات؟! بێگومان نەخێر **{وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَى}**[3].واتە: خوای پەروەردگار خاوەنی هەموو سیفاتی بەرز و بڵند و

---

[1] ال عمران .{197}
[2] السجدة.{18}
[3] النحل .{60}

پیرۆزە . لە قیامەتیش ئەوانەی ئیماندارێکی لە خواترس بوون لە دنیا خۆیان ماندوکرد وەك ئەوانیتر نەبوون کە گوێڕایەڵی فەرمانی خوانەبوون .{أَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ جَنَّاتُ الْمَأْوَى نُزُلًا بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ}[1].واتە: بەڵکوئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە وکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، شوێنیان باخچەکانی بەهەشتە کە بۆ هەمیشە جێگەی حەوانەوە و حەسانەوەیانە، هەر لەوێدا دەبەزن، لە پاداشتی کار و کردەوە یەك کە دەیانکرد . برای بەڕێز خوشکی سەنگین تا لە ژیانین فرسەتە بۆمان بابەندەی خوای گەورە بین چونکە ئەم ژیانەی دنیا یەکجارە و تەواو کە مردی جارێکیتر ناگەڕێیەوە بۆ ئەم دونیا کاتیە ئەو جا گەر بۆ خوا ژیابین ئەوە گرنگە بۆ ئێمەی موسڵمان، وە ئەو کاتەی کە دنیا خراپ بوو لە گۆڕەکانیان دێنەدەرەوە {ذَٰلِكَ يَوْمُ الْخُرُوجِ}[2].واتە: دیارە کە ئەوە ڕۆژی هاتنە دەرەوەیە لە توێی خاکدا. ئەوجاکە کاتی حەشر و حیساب تەواو بوو باوەڕدار و بێ باوەڕ لە یەك جیادەکرێنەوە هەر یەکە و بۆ شوێنی خۆی لەپاداشتی کردەوەکانیان کە لە دونیا ئەنجامیان دابوو، بەرەو بەهەشت و بەرەو دۆزەخ بەڕێدەکرێن.

---

[1] السجدة .{19}
[2] ق .{42}

**(عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِع مَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَ): أَنَّ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا صَارَ أَهْلِ الْجَنَّةِ إِلَى الْجَنَّةِ وَصَارَ أَهْلِ النَّارِ إِلَى النَّارِ: أُتِيَبِ الْمَوْتِحَتَّى يُجْعَلَ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ ،ثُمَّ يُذْبَحُ،ثُمّ يُنَادِي مُنَادٍ: يَا أَهْلِ الْجَنَّةِ لَا مَوْتَ،و يَا أَهْلِ النَّارِ لَامَوْتَ. فَيَزْدَادُ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَرَحًا إِلَى فَرَحِهِمْ،وَيَزْدَادُ أَهْلِ النَّارِ حُزْنًا إِلَى حُزْنِهِمْ)**[1]. واتە: لە عبداللە ی کوڕی عمرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت) : کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: کاتێ بەهەشت یەکان بەرەو بەهەشت یەکلاییکرانەوەو، دۆزەخیەکانیش بەرەو دۆزخ یەکلاکرانەوە . مردن دەهێنرێت، لە نێوان بەهەشت و دۆزەخ دا سەردەبڕێت، ئینجا جاڕ چیەك جاڕەدات: ئەی بەهەشتیەکان ئیتر مردن نیە، ئەی دۆزەخیەکان ئیتر مردن نیە، ئینجا بەهەشتیەکانیش لەسەر و دڵخۆشییەکەیانەوە هێندەیتر دڵخۆشدەبن، و دۆزەخییەکانیش لە سەرو خەفەتەکەیانەوە هێندەیتر خەفەتباردەبن. بەڵێ لە قیامەتیش مردن نامێنێ بۆ یەکجاریە، بەندە بۆ خوا سولحاوەکان ئەوانەی لە دنیا زۆر ماندوو ببون لە تاعەت و گوێڕایەلی، موسڵمانێك بوون هەردەم لە خزمەت خەڵکی بوون یارمەتیان ئەدان، خەمی هەژار و فەقیر خەمی خۆیان بوو موسڵمانێك بوون بەدڵ لەگەڵ خوای گەورە بوون واتە بەڕاست و دروستی لە قیامەت دا دەڵێن:

[1] {صحیح البخاری}

**{وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ}**[1].واتە: ئینجاهەمووان لە خۆشیدا دەڵێن: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە هەرچی غەم و پەژارەی لە دڵ و دەروونی دەرکردین، بەڕاستی پەروەردگارمان زۆر لێخۆشبوو سوپاسگوزارە . لەو کاتە دا خەم و خەفەتی دنیایان هەموو لەبیر دەچێت کاتێ دەگریان لەبەر ئازار و کێشە و گرفتەکانیان بەڵام لە کاتی چوونە بەهەشت هەمووشتیان بیردەچێ و کات کاتی خۆشیە. **{الَّذِي أَحَلَّنَا دَارَ الْمُقَامَةِ مِنْ فَضْلِهِ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ}**[2].واتە: ئەوخوایەی کە جێنشینی کردین لەماڵی هەمیشەی دابە بەخشش و ڕێزی تایبەتی خۆی ئیتر هیچ نەخۆشی و ناخۆشیەك توخنمان ناکەوێت، هیچ ئازار و ئێشێکی دەروونی توشمان نابێت و هیچ بێزاری و ماندوو بوونێکیش ڕوومان تێناکات . کەوایە با کۆشش بکەین بۆ پاداشتی بێ وێنە با دوانە کەوین لەکاروان تابێ بەش نەبین لە خۆشی بەهەشت .

---

[1]فاطر .{34}
[2]فاطر.{35}

# دوا ووته

دوا ووتەمان لە ناخی دڵمانەوە پێشکەشبێ بەهەموو موسڵمانێکی خواویستی قوتابی قوتابخانەی ئیسلام و شوێنکەوتەی پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ).وا لێرەوە هاتینەکۆتا بابەت بەڕاستی هەموو شتێك دەبێت کۆتای پێبێت ئەوەی لەدنیا بوونی هەیە . پێیان ئەڵێین ئەم ژیانی دنیا هەتا سەربۆ کەس نابێ ئەی براو خوشکانی بەڕێزم، دەبێ ڕۆژێك ماڵئاوایی بکەی بە ناچاری گەر پێت خۆشبێ و پێت ناخۆش بێ، ئەوجا دوای ماڵئاویی کردنت لە ژیانی دنیا لەخزم و کەسوکار بێئەوەی ڕۆژی دەرچوونت بزانن، دوای چوونت بۆ دنیاکەی تر کە قیامەتە چەند ڕۆژێك خەمت بۆ دەخۆن بەهۆی بەجێ هێشتنیانت. دوای ماوەیەك لەجێهێشتنت لەبیرت دەکەن، بەهۆی سەرقاڵبوونیان بە دنیا و تێپەڕ بوونی ڕۆژگارتۆیان بیرنامێنێ. ئەی بەندەی خواهیچ کات دڵت خۆش مەکە بەدنیا و شتەکانی دنیا، وامەزانە خزم و کەس وکار هەمووشتن بۆتۆ هیچ سوودیان نییە هیچ شتێك بۆت گرنگ نییە لە ژیانی دنیا پارە یا ناو بانگ یا جوانی هیچ کام لەمانە سودی نییە بۆت، تا لە ئاخیرەت نەجاتت بدەن لە سزای خوا، لەو ڕۆژە هەرکەسەو خەمی خۆیەتی دەی ئەوی خۆی ڕزگار بکات.

{يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَنْ نَفْسِهَا}[1]. واتە: ڕۆژێك دێت كە هەموو كەس خەمی خۆیەتی، بەرگری لە خۆی دەكات، دەی ئەوی خۆی ڕزگار بكات گوێ بە خزم و كوڕ و كچەكانی نادات تەنها خەمی خۆیەتی تا ڕزگاربێ لە عەزابی دۆزەخ خوا پەنامان بدات. بگرە كەسی تاوانبارو بێباوەڕ ئامادەن منداڵەكانی خۆی هەموو بكات بە قوربانی خۆی تاكو بەس ڕزگاری ببێ لەعەزابی دوواڕۆژ، {يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ}[2]. واتە:تاوانبار و گوناهكار ئاوات دەخوازێت كە ئەگەر بكرێت بۆ دەرباز بوونی خۆی لە سزای ئەو ڕۆژە هەموو كوڕەكانی بكاتە قوربانی خۆی. ئەی براوخوشكانی من كێ پێی خۆشە ئا لەو ڕۆژە كوڕ و كچەكانی بە ویستی خۆی بیانخاتە نێوئاگری سوتێنەر لە پێناو خۆیدا! تا بەس خۆی نەجاتی بێ لەسزاو عەزابی ئەو ڕۆژە خوا بمانپارێزێ. بەڵام هیچ سوودی نییە لەو ڕۆژە گەر هەموو دنیا هی تۆ بێ ببەخشی تابەس ڕزگارتبێ ئەوە خەیاڵێكی خاوە.{وَمَنْ فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنْجِيهِ}[3]. واتە: بەهەرچی دانیشتوانی سەرزەویش هەیە ئەگەر بۆی بكرێت بیكاتە قوربانی خۆی، پاشان خواڕزگاری بكات.ناكرێت تۆ لەدنیا سەراپای تەمەنت هەموو بێفەرمانی خوا بێ هیچ چاكەیەكت نەكردبێ لەژیان! لەكاتێكدا خەڵكی وا هەبوو كەڕ بوو پێی نەبوو شەلەل بوو هەموو كات مەردی مەیدان بوو بۆخوا

[1] النحل .{111}
[2] المعارج.{11}
[3] المعارج.{14}

پەرستی.بەڵێ کچەکانت هەمووی سفور و ڕووت بوون نەتئەتوانی ئامۆژگاریان بکەی بەوەی وازبێنن لەسەرپێچیکردن و سنوری خوا مەبەزێن {تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا}[1].واتە: ئەمانە سنوورانی خودان و نزیکیان مەکەونەوە. برای بەڕێز خوشکی سەنگین بیر بکەنەوە تاکەی نابن بە موسڵمانێکی بۆخوا سوڵحاو وا کەسی خراپەکارو سەرپێچی کەری فەرمانەکانی خوا. دەی ئەوی هەمووشتێك بدات خزم و کەسوکار و ماڵ ومنداڵ دنیاو ئەوەی لەدنیان، تابەس نەجاتی بێ لەسزای خوا، بەڵام خوای گەورە هەمووشتێك ڕەت ئەکاتەوە پاداشتەکەی ئەداتەوە کە ئاگری بەدە. {كَلَّا إِنَّهَا لَظَى}[2]. واتە: نەخێر...ئەو ئاواتانە هیچی نایەتەدی...بەڕاستی دۆزەخ ئامادەیە و بڵێسەدارە و داخ لە دڵە. ئێستا زانیت حاڵی کەسی دنیا پەرستەکان چۆنە لەقیامەت. بۆیە لەو ساتەوە وەرن با پەیمانێکی پتەوبدەین لەگەڵ خوای رب العالمین بۆ بەدەستهێنانی بەهەشت، تا لە ژیانین بۆخوا بژین فەرمانەکانی جێبەجێ بکەین هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ)پێی ڕاگەیاندووین لەخۆشی و ناخۆشیدا لەهەبوونی و نەبوونیدا،دڵنیابە گەرشەو و ڕۆژ ماندووش بین بەخوا پەرستیمان لەلای خوای گەورە بەهەدەر ناڕوات.

---

[1] البقرة.{187}
[2] المعارج.{15}

بۆیــە باپێشــبڕكێ بكــەین بــۆ بەدەســتهێنانی ڕەزامەنــدی خــوا تــا ئەوبەهەشتەی پانتایەكەی بەقەد ئاسمان و زەوییە {**سَابِقُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ**}[1]. واتە: پێشبڕكێ بكەن بۆ لێ خۆشـبوون لەلایـەن پەروەردگارتانـەوە، وە بـۆ بەهەشـتێك كـە پانتاییەكـەی بـە وێنـەی پانتـایی ئاسـمان و زەوییـە. كەسـانێك هـەن پێشـبڕكێ دەكـەن بۆشـتێكی دنیـا كاتی، بـەڵام وەرن بـا ئێمـە پێشـبڕكێ بۆخـەڵاتێك بكـەین كـە لەلایـەن دروسـتكەری ئاسـمان و زەوی ئامـادە كراوە. بەڵام لەبیری نەكەن بۆئەوەی ناونووس بكرێن لەو پێشبڕكێیە دەبــێ قوتــابی قوتابخانــەی ئیســلام وشــوێنكەوتەی پێغەمبــەری ئازیز(ﷺ)بین، تا شمولی پێشبڕكێكە بكەین.

[1] الحدید.{21}

# له کۆتایی

سوپاس بۆخوای پەروەردگار ئەو بەهرەی پێ بەخشیم کە بەنووسین لەخزمەت دینەکەیدابم، لـەم تەمەنـەی لاویەتیدا کـە بەنـدە تـەنها (20) ساڵە،خواخۆیبەنیازیدڵەکانئاگادارە ئەم کتێبەم نوسیووە تەنها بـۆ ڕەزامەنـدی خـوا هـیچ چاکـەو پاداشـتمان لەکـەس نـاوێ {لَانُرِيدُمِنْكُمْجَزَاءًوَلَاشُكُورًا}[1]. واتـە: نـە پاداشـتمان لێتـان دەوێـت نـە سـوپاس. بۆ ئەوە نـەمان نوسـیوە تـاکو شـتێکی دنیـایی پێ بەدەست بێنین یان بۆ هەر بەمەستێکی تر بۆیە. خوێنەری ئازیز ئەم کتێبەی بەردەستت بەندە یەك ساڵ خەریکی نووسینی بوومە نامەوێ باسی ئەوە بکەم کەچەند ماندوو بوومە، بەڵام خەمی سەرەکیم ئەوە بوو کـە چاپبکرێ و هـەتا زووە موسـڵمانان سـوودی لێ وەربگـرن بەتـەنها ئەگـەر یـەك کـەس کـەمێك ترسـی خـوای پـەروەردگار بکەوێتـە دڵی بەهۆی ئەم کتێبـەوە، بۆمن دنیایەك دێنێ. نەك بۆئەوەی ناوبـانگم هەبێ یا بۆشتی دنیایی بەڵکوبۆکەوتنە ژێر ڕەزامەندی خوای گەورە. زۆر سوپاسـی مامۆسـتای خۆشـەویت ئەکـەم (ڕەنـج شـێخانی ) کـە ئەرکی پێداچوونەوەی گرتە ئەستۆ ، خـوای گەورە ماندوو بونەکەی بـۆ بکاتـە هـۆی سـرینەوەی تاوانـەکانی بیکاتـە جیرانـی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) .وە زۆرسوپاسی هەموو ئەوبراو خوشکانە ئەکەم کە ئەرکی

[1] الأنسان.{9}

چاپەکەین گرتە ئەستۆ ئەوانەی گەر بە کەمترین بڕە پارە هاوکارمان بـوون الله بە باشـترین شێوە پاداشـتیان بداتـەوە . خـوای پـەروەردگار هـەمووومان بەیەکـەوە کۆبکاتـەوە لـە بەهەشـتی فیـردەوس. داواکـارم لەخوێنـەرانی ئـەم کتێبـە لـەدوعاکانیان ئـەم بەنـدە تاوانبـارە لـەیاد مەکـەن وەهــەر هەڵـەو کـەم وکوڕتییـەکتان کە بـەرچاوتان کـەوت چاوپۆشـیم لێ بکـەن. خـوای گـەورە پاداشــتی هـەمولایك بداتــەوە. خوایە شاهێد بە من ئەرکی خۆم گەیاند.

اللهم انی قد بلغت اللهم فشهد.

بۆ هەر پێشنیارو تێبینییەك دەتوانن بەم ئیمەیڵەی خوارەوە، بۆم ڕەوانە بکەن، یاخودسەردانی ئەکاونتی فەیسبووکم بکەن بەناونیشانی.

بەندە: عبدالله مەهدی،
ناسراو بە: عبدالله خاکی
9ربیع الاول1437
2015/12/20
www.faecbook.com/Abdullah Xaki
Email:abdullahxaki@yahoo.com

{ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ }

# پــێــرســـت

# سەرچاوەکان:


- قورئانی پرشنگدار
- تەفسیری ئاسان.........بورهان محمد امین
- تەفسیری ڕامان........ شێخ احمدکاکەمحمود
- پوختەی تەفسیری قورئان....مەلا محمد مەلا صالح
- فەرمووده هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم...حەمە کەریم عبدالله
- ٢٤٠فەرموودەی مرواریی لەسەحیحی موسلیم و بوخاری..ئەبو ئەنەس کوردی
- سەحیحی موسلیم......نوری فارس حمه خان